دیوانە شیعر

# ڕێگای هۆشمەندی




## فەرهاد جەوهەر برادۆستی

چاپی یەکەم

٢٠٠٥ز - ١٤٢٦کۆچی

## دیوانی

# ڕێگای هۆشمەندی

فەرهاد جەوهەر برادۆستی

٢٠٠٥

هەولێر

# بسم الله الرحمن الرحيم

* ناوی کتێب:   ڕێگای هۆشمەندی

* بابەت :    شیعر

* دانەر :     فەرهاد جەوهەر عەبدوڵڵا

* پیت چنین و نەخشەسازی: کۆمپیوتەری (هیوا)

* هەڵەچن : پیرە لاو

* تیراژ :   (  ٧٥٠  ) دانە

* ژمارەی سپاردن (٦٤٤) ساڵی ٢٠٠٥

* چاپ  : چاپەمەنی سیما – سلێمانی

## پێشکەش بێ :

* بە گیانی پاکی پێغەمبەری پێشەوا سەلات و سەلامی خوای لەسەربێ .

* بە هاوسەرەکەم و منداڵەکانم , کە بەهۆی منەوە زۆر ماندوو دەبن .

*بە هەموو ئەو کەسانەی کە یارمەتیان داوم لە نوسینەوە و ئامادەکردن و چاپکردنی ئەم دیوانە شیعرە .

* بە هەموو ئەوکەسانەی کە لەخەمی ئەو دینەدان و داریکیان لەسەر بەردێک داناوە بۆ خزمەتی ئەم ئیسلامە پاکە .

* بە هەموو موسڵمانانی جیهان , بە تایبەتیش موسوڵمانانی کورد .

## بەناوی خوای گەورە

هەر لەو ڕۆژەوە کەخوای گەورە مرۆڤی کردە جێنشینی خۆی لەسەر زەوی بەر بەرەکانێ لەنێوان(حەق و ناحەق)دا بووە تادنیاش ماوە هەردەبێ.

جا یەکێ لەو ڕێگایانەی کەدیفاعی پێدەکرێ و بەکاردەهێنرێ بەرەنگاربوونەوەی زمانە کە دەتوانین پێی بڵێین (ڕاگەیاندن) دیارە زمانیش شێوازەکانی دیفاع کردنی زۆرە و یەکێ لەوانە بەکارهێنانی (شیعرە) کەپێم وایە کاریگەریەکی زۆری هەیە و هەبووە , بۆیە دەبینین کەپێغەمبەرمان (سڵاوی خوای لێ بێ) بەشاعیرەکانی دەفەرمووێ (دایك و بابم بەقوربانتان بێ)

کاك فرهاد برادۆستیش یەکێك لەوشاعیرانەیە کە لەسەردەمی ئەمڕۆدا لە سەنگەر و ڕووبەڕووبوونەوە دایە دژ بەتاریکی , وە پێشم وایە بەڕاستی شیعرەکانی لەئاستێکی زۆر باش دانە و کاریگەری خۆیان هەیە, بۆ یە من دەست خۆشی لێ دەکەم وهیوام وایە هەرسەرکەوتوو بێ و قەڵەمی بۆ نووسینی ئەم جۆرە شیعرانە و شیعری باشتریش ، ئەوەی کە من ڕەچاوم کردووە لەشیعرەکانی کاك فرهاد دا بە بۆچوونی من (تەشبیهی) زۆر بەکارهێناوە تەشبیهی هەندێ کەسێ بە (خەڵکی جادە یاشێتی جادە) کردووە یابە(نێردۆشین) هتد. کە ئەمەجۆرێکە لە شیعر.

ئەوەی کەزۆر سەرنجی ڕاکێشاوم بەڕاستی ئەوەیە کە گەنجێکی وەکو کاکە فەرهاد کە زیاتر لە چەندساڵێکە هەردوو قاچ و هەردوو دەستەکانی لەکارکەوتوون و بەلام ئەو بەخۆی و کورسیە گەڕۆکەکەی لەکارنەکەوتون بۆ خزمەتی ئەم ئیسلامە و ماندونەبووە کەچی زۆرێ لەساغەکان هیچ خەمێکیان نیە بۆ خزمەتی ئەم ئایینە پاکە کاتێ ئەم دڵسۆزیە بە کاك فرهادەوە دەبینین چی بەخۆیان دەڵێن؟!

بەڕاستی من دووبارە و سێ بارە دەست خۆشی لەکاکە فەرهادی ئازیز دەکەم و داواشم لەخوای گەورەیە کەشیفایەکی پەلەی بۆ بنێرێ وە داواش دەکەم کە هەرکەسێ ئەم نوسراوە دەخوێنێتەوە دوعای خێری بۆ بکات ، ماوە ئەوە بڵێم زۆر سوپاسیشی دەکەم کە ئەم ڕێزەی دایە من کەپێشەکی بۆ بنوسم هیوام بەختەوەریەتی.

**براتان پیرە لاو**

**١٠/رەجب /١٤٢٦**

**٢٠٠٥/٩/١٤**

# نـــاوەڕۆك

# شیعرەکانم

شـیعرەکانم زۆر دڵسـۆزن مانـدوون بـە زمـانی بانگـەواز
تا خەڵکانێك بچنە ڕێی ڕاست دەست بەردەن لە کلکی بەراز

شـیعرەکانم بـەهیچ جـۆرێ چـۆك دانـادەن گـەلێ نـازان
لە سـەنگەری خـەبات دانـە شان بەشانی ڕاسـتی خـوازان

تـازە چـاویان هـەڵێناوە , داسـی دەسـتی نـەوەی نوێنـە
هەسـت و نەسـتی ئەوانیـشن , ئامادەنـە بـۆ دروێنـە

شیعرەکانم هـەتا مـردن هـەر لـە نـاو سـەنگەری پێشن
کۆڵنـەدەری زۆر لێهـاتون , خـاوەنی گـورزی بەئێـشن

ڕیـسواکەر و تۆقێنـەری زەردەواڵـە و قـەل و مێـشن
ڕیـشەی هـەموو خوانەویـستان لەڕەگـەوە هەڵدەکـشێن .

شیعرەکانم لەبۆ عەردی ووشك و مـردوو هـەوری پەڵەن
دەم کـوت کـەر و ئـابڕو بـەری هـەموو ڕێبـازێکی هەڵەن

شـیعرەکانم لـە بـەردەمی ڕەوەی گورگـان پاڵـەوانن
لـە قـوڵایی دەریـای سـامیش بـێ وێنـەن و مەلـەوانن

شـیعرەکانم شـۆڕش گێـڕن زۆر بەسـامن شـێری بێـشەن
چـاونەترس و بلیمـەتن بـۆ مـستی سـتەم وەك درێـشەن

شـیعرەکانم , زۆر بەتونـدی سـتەمکاران ئەتاسـێنن
بـە مـەرگێکی بێـشەرمانە , گیـانی پیـسیان ئەناسـێنن

شـیعرەکانم خـەباتکاری ڕاسـتی ویـست و زەنـدەق بـەرن
ووره و هێزی دەسـت و بـازووی قارەمـانی نـاو سـەنگەرن

شـــیعرەکانم بۆخـــەڵکانێك ژانـــی دڵ و دەردی ســـەرن
گوڵـە بـاخی ڕۆخ کانیـاوی ســەر ڕێبـازی پێغەمبــەرنن

شیعرەکانم وەکو شیعری کاك عبـدالله و کـاك حەسانن
ڕێبـواری ڕێـی ڕاسـتەقینەن پەنجـەی چـاوی ناکەسـانن

شیعرەکانم گـورج و گـۆڵن خواپەرست و خـاوەن ڕیـشن
لەسـەرلوتکەی هـەرە بـەرزی خـودا ناسـی هـەڵ دەنیـشن

شـیعرەکانم بـۆ حـەق ویـستان دەبـن بـە قـەڵغان و زرێ
نـەوەك ڕۆژی بەدەستی ڕەش ، خـوا نەخواسته ، لێیـان درێ

شـــیعرەکانم پـارێزەری ڕیــش و ســیواك و سەرپۆشـــن
فریـوی هـیچ کەسـێ نـادەن هـەتا نێریـان پـێ بدۆشـن

شــیعرەکانم تێکۆشـەری سمـێڵ کـورت و ڕیـش درێـژن
نەفرینی زۆر بەسەر سـەری ناکـەس بەچان هەڵدەرێـژن

شیعرەکانم بـۆ زۆرداران هـەرگیز خـوری ناکـەن بـە ڕیـس
بـەڵام وەك شـێر سام دەنـوێنن لـە نـاو دڵـی ئـەوانی پـیس

شـــیعرەکانم ڕون دیـــارن کـــە هانـــدەری ڕۆڵـــەی دیـــنن

خــەڵکی یــاخی دەتــۆقێنن گڵپــە داری ئــاگر یــنن

سامیان شێری شەوی تارە وەکو هەوران دەگرمێنن
دەهۆڵی سەرشێواندنیش پەردە و پێستی دەدڕێنن

هەڵمەت بەر و لە خۆبوردەن لێو لە کوفر دەگەزێنن
ووردەی ڕاستی بەرز دەکەن شێواوانیش دەبەزێنن

شیعرەکانم وەکو گڕکان ، خۆڵ و بەرد لێک دەناڵێنن
بومە لەرزەی زۆر بەهێزن تەختی زۆردار دەلەرزێنن

شیعرەکانم هەوری پەڵەن ئاوی بە پیت دەبارێنن
گورزی تۆڵە و کەمەرشکێن لە زۆرداران دەوەشێنن

شیعرەکانم لەڕێی خودا ڕم و شمشێری بەخوێنن
هەموو بیر و بڕوای هەڵە بە سەریەکدا دەڕوخێنن

١٩٩٩/١٠/١٨

# إنَّ في الشِّعر لحِكمة

## ژن هێنان

گەنجی خوا ناسی بەڕێز بیرکەوە چونکە ژیری
بەرەو تۆ بەڕێوەیە شالاوی سەختی پیری

تەمەنی گەنجی و لاویت هەل و دەرفەتی چاکە
ببیە بەندەی ئارەزووت , ئایندەت ترسناکە !

تۆ ئەگەر هۆشت هەیە بگرە ڕێگای خواناسی
مەچۆ ناو دڕك و دالان بەقوربان , بەپێ خواسی

کە چۆن دلنیای بێ ئاو ژین ئەستەمە بۆماسی
بەبێ هاوسەرێکی چاك تۆش وەکو ئەو کەساسی

فەرموودەی ڕاست و جوانی سەروەری میهرەبانە
ژن هێنان بەشێوەی ڕاست , نیوەی دین و ئیمانە

لەو مژدەیە بەولاوە , ئەی براکەم چیت دەوێ؟
بەهۆی هاوسەرگرتنت نیوەی بڕوات دەست کەوێ !

بەلام ئەی گەنجی بەڕێز ئەگەر ژیر و لێزانی
نەکەی خۆت مال وێران کەی فریو بخۆی بۆ جوانی

جوانی و کەسایەتی و مال هەتا سەرنیە و دەڕوا
ئەوەی سەر بەرزت دەکا ڕەوشتی پاکە و بڕوا

ئافرەت چەند خاوەن مال و کەسایەتی بەرچاو بێ
نابێ دەست نیشانی کەی گەر ڕەفتاری نەشیاو بێ

ئەگەر کردت بە هاوسەر بێ گومان لەو هاوسەرە
خێر و خۆشی نابینی فەرمووددەی پێغەمبەرە

بەڵام , ئافرەتی دیندار سەربەرزیی هەردوو ژینە
هیوا و کامەرانییە تۆکمەیی بڕوا و دینە

چونکە دەبێتە مایەی سەربەرزی دنیا و دوایی
بۆ تۆ و منداڵە کانت بەدەستورێکی خوایی

٢٠٠٣/١١/١٥

# ا لدنیا متاع ,وخیر مَتاعِها المرأةٌ الصالِحةَ

# ساڵی تــازە

هیــوام وایــە پــەروەردیگار لــەم ســەردەمە و چــەرخە تــازە
بیکـەی بەلێــزی و تـەختی کـەی هەرچی بەربەسـت و هـەورازە
(إنَّ مَــعَ العُــسر يُــسراً) بــۆ گــەلی ئیــسلام بێتــەدی
تاکــو لــە ژێــر یاســای قــەلیش ڕزگــاری بــێ هەرچــی بــازە

خوایــە لێمــان پــیرۆز بکـەی پــڕ بــەدڵمان بــێ ئــەم ســاڵە
زاری ســـەرجەم موســـوڵمانان زۆر لەمێــژە تــرش و تاڵــە
هێــزی ئیــسلام لەســـەر زەوی بکــە بــەهێز و بــاڵا دەســت
هــەوری ڕەشــی نائومێــدی لەبــەر تیــشکی خــۆر ڕاماڵــە

بــەخوێنی ئــاڵی خواناســان کــوفری بــێ شــەرم ســەرقاڵە
موســوڵمانان بــێ غــیرەت نــین بــەڵام نۆکــەر خــاوەن ماڵــە
نۆکەریــەتی خۆفرۆشــان خامۆشــی کــرد ســام و غــیرەت
بۆیــە وا ڕیــش ڕەشــی دوێنــێ ئــەمڕۆ پــیرە و بۆتــە خاڵــە

ساڵی نــوێ هــات خــەڵکان ئێــوەش پڕبــەدڵ بــەخێری بێنــن
بــەو مەبەســتە پێــشوازی کــەن کــە بــاوەڕی تیــا بــڕو ێنن
لەگــەڵ خــوا یــەك لابینــەوە خۆتــان لــە ڕاســتی گێــل مەکــەن
جگــە لــە خــوا ســەری شــکۆ بــۆ هــیچ کەســێك دامــەنوێنن

٢٠٠١/١/١

# توانج و تانە

وەك ڕۆستەمی مازدندران کەسێك ئەگەر پاڵەوانە
خزم و خەڵکی لەلا کۆ بن , بەڕیز وەکو نووکی شانە
بەڵام ئەگەر لەزاری بن دژ بە ئیسلام توانج و تانە
نادانێکی وای زمان لووس چ دۆست بێت و چ بێگانە
گوێی دەگرم ، ڕاپێچی دەکەم دەیبەم لەبۆ تەوێڵ خانە
چونکە ئیسلام ئەولا ترە لەو سەرگێژە بەستەزمانە

٢٠٠٢/٩/٢١

# بەرەڵایی

ئەمڕۆ ئاسمان موڵکی قەلە، ڕێویش لەسەرعەرد قەڕاڵە
سەرانسەری دونیادەکەن بازیش داوی لە پێ و باڵە
بۆڵەی ئەوان ڕەوا و ڕاستە، ڕاستیش شەق شەقەی مناڵە
بازی بەرزیش ترسنۆکە قەلەڕەش ڕۆستەمی زاڵە
نیوەی هەنگی ئەو دونیایە بوونە مێش و زەردەواڵە
لەسەر چڵکاو هەڵدەنیشن هەنگوین لایان تفت و تاڵە
پێشان ڕێی ژینیان تەخت بوو ئێستا پڕ لە کەند و چاڵە
بەڵام ، دارێك کرمی لەخۆی نەبێ عومری هەزار ساڵە

٢٠٠٢/١١/١٤

# دایــك

دایکـــی بـــەڕێزم ئـــاواتی گیـــانم
ڕاســتی سەرچــاوەی پێگــەی ژیـــانم

گیـــانی ڕەوامـــی ئـــەی دایکـــی ئـــازیز
چـــاکەت لەچـــاوم دەرناچـــێ هـــەرگیز

دەبــێ بــۆت بــاش بم فــەرمانی خوایــە
بەهەشــتیش لــە ژێــر پێــی پاکـت دایــە

جا چۆن دەڵێ ئۆف ئەو دڵە شێتە ؟!!
دەیکـەم بـەو خاکـەی کـە لـە ژێـر پێتــە

دایکی بەڕێزم نۆ مانگ و چەند ساڵ
بــەهۆی مــن چەشـتت ژان و ژینــی تــاڵ

نــە ڕۆژت ڕۆژ بــوو نــە شەویــشت شــەو
لــێم تــاڵ ئــەکردی پــشوودان و خـــەو

تـۆش بەسـۆزێکی زۆر هەسـت بزوێنــی
بــێ ئــەوەی ڕوخــسارگرژی بنــوێنی

هەڵدەســتایتەوە لـــە خـــەو بەخۆشـــی
لـــە باوەشـــی ســـۆز دامـــت دەپۆشـــی

مانـــدوم دەکـــردی بەهـــەموو جـــۆرێ
ئـــەتۆش بـــێ ئـــەوەی دڵـــت بتـــۆرێ

بــــه لایەلایــــه لـــەددوری ســـەرم
دەســـــوڕایتەوە بەهەســـــتی نـــەرم

بۆیـــه هـــەرکاتێ کۆرپـــەك دەبیـــنم
خـۆم دێتـه بـەر چاو , دایکی شیرینم

تـــاکو کفنیـــشم بـــۆ هەڵـــدەدورێ -
ســەر لــه گــۆڕی تــار دەبەمــه ژوورێ

گیـانم لــەژێر پێــی تــۆ بتوێتــەوە
پاداشــتی چــاکەت پــێم نادرێـــتەوە

ئینجـــا ئازادکــــه دایــــه گــــەردنم
تـــاکو لاڵ نـــەبم کـــاتی مـــردنم

گــەر ئـازاد نەکــەی گــەردنم گیانــه
چـێژ و تـام ناکـەم لـەو مـان و ژیانـه

هــەتا بمێـــنم هـــەر دەکـــەم نـــزا
خـودای بـالآ دەســت تـۆ نـەدا ســزا

٢٠٠٣/٢/٢١

الجَنَّةُ تَحتَ أقدامِ الأمَهات

# باوك

باوکە جێگای تۆ لە نێو دڵمایە
خۆشەویستی تۆ پڕ بە دنیایە

بە بەردەوامی وا تۆ دەکۆشی
تاوەکو بژیم بەشادی و خۆشی

دەخولێیتەوە لە دەوری سەرم
بە هەستێکی پڕ لە سۆزی گەرم

بەیانی زوو زوو هەڵدەستی لە خەو
ماڵێ جێ دێڵی بە تاریکی شەو

بە دڵ گوشادی و هەستی پڕ سۆزت
دەچیت لە بۆ سەر کاری پیرۆزت

کاتێ ئێواران دێیتەوە بۆ ماڵ
لەبەر شەکەتی دەکەی ناڵە ناڵ

ئینجا ڕەنجی خۆت باوکی نازدارم
وەکو چۆلەکە دەکەیتە زارم

پەروەردەت کردم هەر لە منالی
تاکو خۆم ناسی و لەخۆ بوم حالی

بـەڵام داخەکـەم ئـەی باوکـە پـیر بـووی
کارکـــەرێکی زۆر لێـــزان و ژیـــر بـــووی

مـــن دەبمـــە کارکـــەر باوکـــە هەمیـــشە
هێـــــزت نـــــەماوە ئـــیتر دانیــــشە

مـــەخابن پیربیـــت ئـــەی بـــاوکی پـــیرم
هـــەرگیز زیرەکیـــت ناچـــێ لـــەبیرم

پـــەیمانیش دەدەم تـــا لـــە ژیـــان مـــاوم
گـەر پێـت بخەیتـە سـەر پێڵـوی چـاوم

نـــاڵێم ئـــۆف ، بـــاوکی چـــاك و بـــەڕێزم
چـــاکیت لـــەناو دڵ چـــاك دەپـــارێزم

جیاوازیـــت نیـــە تـــۆ لەگـــەڵ دایـــە
ئـــەو دڵـــەم بـــۆ تـــۆش لەخزمـــەت دایـــە

بـــەڵام گـــەردنم ئـــازاد کـــە باوکـــە
پـــەڕێزی حـــەزم , گیانـــە پاراوکـــە

لـــە کۆتـــایی دا ئـــەی میهرەبـــانم
بـــۆ تـــۆ بەرزەکـــەم دوو دەســـتەکانم

تـــۆ بەخـــشندەکی زۆر بـــاڵا دەســـتی
بـــاوکـم دوور بـخـەی لـە غـەم و پـەسـتی

# ئەی خاوەنی ئەو جیهانە

ئـــــەی خـــــاوەنی ئەوجیهانـــــە
ئــــەتۆی دروســـــت کـــار ؛ غـــەفوری
ژیــــنم سەرپێـــــچی و تاوانـــــە
دەبـــێ هەســـــتم بـــە مـــــەجبوری
بگـــرم ڕێگـــای تـــۆی بـــە توانـــا
تـــاکو بـــژیم بـــە ڕوو ســـوری
بـــــەلای تـــــۆوە زۆر ئاســـــانە
لـــە منـــی شـــەرمەزار ببـــوری

ئینجـــا دڵـــەی مـــن بەســـە خـــەو
تاکـــەی ناخـــت هـــەر تاریکـــە ؟
وا خـــۆر هـــەڵات , نـــەماوە شـــەو
هۆشـــــت بەچـــــیەوە خەریکــــــە؟
گـــوێ مـــەگرە لـــە خـــەڵکی چـــەپ ڕەو
خـــودای گـــەورە بـــێ شـــەریکە
بوونـــت لەئاســـتی هێـــزی ئـــەو
وەك مـــوو ؛ بـــێ هێـــز و باریکـــە

هـــــەموو کاتـــــێ دەســـــتەکانم
بـــەرزن بـــۆ ئـــەو خـــودا وەنـــدە
دەور و پـــــشتی ڕێـــــی نیمـــــانم
لیتـــەی چـــێر و کۆســـپ و کەنـــدە
بـــــە تـــــەنیا و تاکـــت دەزانم
بـــەزەیی کـــە بـــە منـــی بەنـــدە
بـــــەبێ تـــــۆ ئـــــەی میهرەبـــانم
دڵـــــم تـــــار و زەرەرمـــــە نـــدە

خوایـــــەکی بـــــەرز و شـــــاکاری
دانانەکـــــەت لـــــەجێی خۆیـــــە
بـــــە گریـــــە و شـــیوەن و زاری
دڵـــم لـــە پـــێش دەرگـــای تۆیـــە
بـــــەو دامـــــاوە ئاگـــــاداری
لێـــی وەرگـــرە ئـــەو ڕۆژۆیـــە
گـــــەر لەخـــــەرمانی ببـــاری
هـــەموو ڕەنجـــی بـــە فیرۆیـــە

٢٠٠٢ /١١/١٧

# پەشیمان بەوە

چی تاوان بوونەنجامت داشەرمت لەخوا نەکرد شێتە
تامی زۆرت لە تاوان کرد بەڵام تۆڵەی چاوەڕێتە

خوا ئەو مافەت لێ ئەسێنێ گرتنیشی بە سۆ و ئێشە
گەر پەشیمان نابیتەوە زۆر بازگەی سەختت لەپێشە

ئەو شتەی کەئەت کردووە بۆت ئەلواوە سەر سەختی مەست
ڕۆژێ هەردێ ئەو کردانە لەسەر ڕێگات ببنە بەربەست

تا جڵەوت گیرنەبووە لە تەڕاشی مەرگ و مردن
چۆك دابدە و بکڕوزێوە ، چالاکیە مل کەچ کردن

دەست لەملی حەزەکانت مەکە چیتر , ڕوو بکە چاکە
بترسێ لە دەر ئەنجامێك کە نادیار و ترسناکە

بۆ بەوجۆرە فەرامۆشی,شەرمە دیلی دەستی حەزی؟
پەنجەی پەشیمان بوونەوە ڕۆژێ هەر دادێ بگەزی

هەموو خۆشی تامی تاوان بوو بەهەڵم و ڕەوایەوە
شەرمەزاری و خەجاڵەتیش بۆت لەشوێنیانا مایەوە

ئەوەی کە ئەنجامت داوە لەپێناو ئارەزووت دوێنێ
چاك بزانە ئەی بێ ئاگا دوا ڕۆژت لێ دەشێوێنی

لەپـــەڕاوی کرددودکـــەت ئـــەو تاوانـــە هـــەرددمێنیَ
تـا لـە گۆڕدپـانی دواڕۆژ خـودای گـەورە ددتودسـتێنی

جـا براکـەم . بگـەڕێوە بگـرە ڕێگـای چـاکە کـاران
پـێش ئـەوەی خـەزانی تـەمـەن زەردتکا وەك گـەڵای داران

٢٠٠٣/٤/٢٢

# كُل بَنی آدم خطاءَ وخيرُ الخطائينَ التوابون

# من و بولبول

بولبولێکی باڵ نەخشینم بینی لەسەر چڵی گوڵێک
داخ و بەژارەی ئەخستە دڵی هەموو خاوەن دڵێک

باڵەکانی داخستبوون بە بێزاری و بە غەمباری
ئەشکی زۆری لەچاوان بوو لێی تۆرا بوو کەیف و یاری

منیش پێم وت: ئەی دەنگ زوڵاڵ بۆداماوی کوانێ نازت؟
ئایە گوڵ و گوڵزارەکان گوێ ڕاناگرن لە ئاوازت ؟

بولبولیش بە زمانی شیرین وتی : ئەی عاشقی دەنگم
پێت دەڵێم ئاخۆ لە بەر چی هێندە داماو و دڵتەنگم

خەتای گوڵ نیە بەقوربان کەوا وەك تازیەدارانم
هەرگیز لەگوڵ نەڕەنجاوم هەر عاشقی جاری جارانم

بەڵام بەرلەوەی پێم بڵێ ئاهێکی قووڵی هەڵ کێشا
دڵی ڕەقی زۆردارانیش بەو ئاهە ساردەی دەیێشا

ئینجا ووتی : لێم ببورە ئەگەر ناکەم گاڵتە بازی
لەداخی ئایندەی ڕەشم , دڵی من مردن دەخوازی

دەستی ڕەشی چڕنووك درێژ گیرە لە ملی ڕاستی خوازی
چونکە قەل و ڕێوی لەجێی باز و شێران بوونە قازی

٢٠٠٤ /٧/١٥

# ﴿ وما أرسلناك إلارحمة للعالمين ﴾

ئەی پێغەمبەر خۆشەویستم تاجی سەر و بیلبیلەی چاو
ڕێبازێکت بۆمان دانا بێ بەربەست و هەڵدێر و داو

بەند بە بەندی ئەم ڕێبازە بۆمان بۆتە یاسا و دەستوور
ئێمەش تاکو لە ژیان دابین هەرگیز نابەزێنین سنوور

چاوی گەشت کە هەڵێنا تۆی دادوەر و ژیر و ووریا
شەمشەمەکوێری ئەو سەردەم بە فرمێسکی خوێن دەگریا

شەوی تاریکی ڕەویەوە ڕوناکی کەوتە ناوجیهان
فیرعەونەکان و یاسایان بنی دەریا بوو بەجێیان

هەردەم لە تێکۆشان دابووی بە زمانێکی نەرم و شیرین
خەڵکت دەردێنا لە گێژاو شارەزات دەکردن لە ژین

خەڵکت وەك گوڵ گەشاندنەوە ڕزگاریان بوو لە خامۆشی
تەنهاخەڵکی یاخی وسەرکەش سووربوون لەسەربەران دۆشی

ئینجا دژ بەدوژمنانت چەکی خەباتت گرتە دەست
هاتە هەژان و هەڵوەری دەستور و یاسای بت پەرست

باڵی کێشا بە سەر خەڵکی ڕۆژگارێکی پڕ سەربەستی
چونکە زۆریت بەزۆر لە ناو زیندانی تەمێ بوون پەستی

١٩٩٩/٧/١٣

# ئەی خوایە

گەورەیی بۆ تۆ باشە ئەی خودای بەدەسەڵات
ڕێز داری بێ ئەندازەی خاوەن بەخشش و خەڵات
ئەو کەسەی کە دانی نا بە تۆ و فەرمانەکانت
خۆرێکی گەش و تازە بەویستی تۆ لێی هەڵات

خاوەن ڕێگا و ڕێبازی ڕاست و پاك و پیرۆزی
بۆ بەندە چاکەکانت بەبەزیی و بەسۆزی
بەزمانی زار و دڵم دان دەنێم بەو ڕاستیە
تەنها بەدەستی تۆیە مردن و مان و ڕۆزی

هێز و زانست و خێرت وەك دەریایەکی مەندە
کەسێ نیە بزانێ قووڵی و پانایی چەندە
خۆش بەختی و ئاسودەیی بۆ ئەو کەسە زانایەی
بەبێ ڕارا و دوودڵی بۆ تۆ دەبێتە بەندە

بەڵام منی نادان وەك پێویست نەم پەرستی
زوو ڕووی تێ کردم دەردی دونیاداریەتیو سستی
ئەوهەردوو دەردەسەختە تۆیان لەیاد بردمەوە
شەیتانیش بە خۆش حاڵی کەلەپچەی کردمە دەستی

ئەوەی تازە دەزانم ئەگەر زووم زانیبایە
هەرگیز نە دەبووم بەتۆپ بۆ بەر پێی ئەو دونیایە
شەقی بەهێز و سەخت لەسەر و کەللەم دەدات
ئەگەر بە هانام نایەیت تووڵامەوە ، خودایە

## زۆردار

ئەگەر دەتزانی ئەی ئەزان کە لە ڕاستی چەندە دووری
لەخوای گەورە شەرمت دەکرد دەهاتیەوە سەر دەستوری
ئەگەی دەستان بچزێنی پێشێلکەی یاسا و سنووری
بێگومان بە , پەتی زۆردار لێک دەترازێ لە ئەستووری

کەسی لە تۆ لێهاتووتر بەجێی هێشتن تەخت و کورسی
ئەویش لە ناودڵی نەبوو تۆزقاڵێک لەخودا ترسی
ڕۆژێک لەرۆژان بەزەییش لەدڵی بێ ئاگای نەپرسی
خەڵکی لەسەردەم دەکێشا بۆ بەردەم ئەژدیهای برسی

تۆ بەنیازی پێت دانێیتە شوێنی پێیەکانی ئەوی؟
خۆ بخەیتە بەر نەفرینی هەمووخەڵکی سەر گۆی زەوی
بەرگەی ڕقی گەلان ناگری ، ئەی ئەزانی نزم و ئەوی
هیـوادارم لـە پێخـەفی فەرامۆشـیدا نەخـەوی

خوا منی بۆ تۆ نەداوە تا بەزۆر و ئاگری گەرم
بەدەستی سوروە بوی بەخوێن زۆر دارانە کوتکەی سەرم
منی ئەبەرد و ئەبەزیو شوێن کەوتەی خوا و پێغەمبەرم
بەرگی بڕوا و باوی راستی پێت داناکەنرێ لەبەرم

٢٠٠٣/٤/٢٣

الظُلم ظُلُماتُ يَومَ القيامة

# ئەی پێغەمبەر

ئـەی پێغەمبــەر پێــشەوامان خــاوەن ڕێگــای ڕاســتەقینە
خۆشەویستی خودای گەورە و ئێمەی شوێن کەوتووی ئەم دینە
هــەوێنی ژینــی برایــی ، ئــاوی ئــاگری ڕق و کینــە
سڵاوی خـوای گـەورەت لـێ بـێ هـەزار هێنـدەی ئـەم زەمینـە

وەکـو مــانگی پرشــنگدار و خــۆرێکی زێــرین هــەڵاتی
میهرەبــانی لەگــەڵ تۆیــا پەڵــەی دایــە نــاو وولاتــی
ملوانکـەی بــۆ ملـی ئیـسلام چـاکترین خێــر و خــەڵاتی
بـە سـەر پێلـۆی هەردووچاومان ئـەی پێشەوا بـەخێرهاتی

ئێمــەی گــزت گەشــاندەوە لەخامۆشـی و کـوێر و کاسـی
بــەرە و بــاخی بەختــەوەری و ڕێگــای ڕاسـتی خوداناسـی
فێــرت کــردین بـچینە نـاخ دەریــای بـاوەڕ وەکـو ماسـی
ئێمــەش نــاوی تــۆی شــیرینمان بــەدیواری دڵ هەڵواســی

گەر ڕێبازت نە گرینە بەر وێــڵ دەبیــن دەڕۆیـن بــە جــارێ
لە بــەر ساردی و سـەرمای پـایز زەرد دەبین وەك گـەڵای دارێ
بــەڵام ئــەتــۆی زانــا و سـەروەر جـێــی ڕاوێــژی لـە گشت کارێ
بــۆیـە چێــژی خــۆشــەویــستـیـت بە نــاخــمــانــا چــۆتــە خــوارێ

٢٠٠٤/٩/١٤

# کوڕە شەهید

کوڕ:

توخوا پێم بڵێ دایکی شیرینم
هەتاکەی تاڵ بێ بە مجۆرە ژینم؟
بابی بەڕێزم کوا , کەی دەیبینم؟
پڕ بەدڵ دەستی لەمل وەرێنم

هاوڕێیانی من زۆر بەدڵ خۆشی
بابیان دەبینن دەچن بۆ کۆشی
منیش دەوەستم کز و خامۆشی
کەس نایە لە کۆش بەسۆز دام پۆشی

دایك:

گوێ بگرە کوڕم بۆ ژار و پەستی
باوکت لەڕێی خوا و لە ڕێی سەربەستی
گیانی شیرینی دانابوە دەستی
تاکو سەربگرێ بەرنامەی ڕاستی

کاتێ لەڕێی خواسەری نایەوە
تازە بوو بوونت داتەکایەوە
تەونی نازداریت هەڵوەشایەوە
لە ناو بێشکەدا بێ باب مایەوە

کوڕ:

پـــەیمان بـــێ دایـــە تـــا منـــیش مـــابم
دڵـــــسۆزی ڕاســـــتی بەرنامـــــەی خـــــوابم
پـــێم دادەنێمـــــە شـــوێنی پێـــی بـــابم
نابـــێ وەك خـــــەڵکی سەرشـــــێت ڕاڕابم

دایك:

گـــەر وابـــێ کـــوڕم جێگـــای دڵ خۆشـــی
دونیـــا و گیـــانی خـــۆت بـــە خـــوا بفرۆشـــی
لەگـــــەڵ چـــاکان و پاکـــان بەخۆشـــی
کەوســـەری بـــەتام تێـــر تێـــر دەنۆشـــی

٢٠٠٣/٤/١٥

إنَ اللهَ إشترى من المؤمنين أنفُسَهُم وأموالَهم بأن لَهم الجَنة

# وریـــا بـــن

ئـــەی ئەوانـــەی کـــە دلێـــرن
مـــــەرد و لێهـــــاتوی بـــــوێرن

ئیسلام گوڵە و ئێوەش هـەنگن
شـێری شـەو و ڕۆژی تـــەنگن

بـــەرگری و هـــەوڵ و تێکۆشـــان
بکەنـــــە نازنـــــاو و نیـــــشان

چـونکە ئێـوە دەسـتی خێـرن
فیکـەی بـاز و نـەڕەی شـێرن

خودای گەورە و بـەتوانا و هێـز
لـەئێوەی نـاوە قـەدر و ڕێـز

کەسێکیش خـوا ڕێـزی لێنـێ
بـڕوا مەکـەن هـەرس بێنـێ

جـــا داوامـــە هەڵـــسن لـــەناخ
ببنـــە شـــوورە لـــە دەوری بـــاخ

ئـاوی بـدەن بـەخوێنی سـور
بەرهـەم دێنـێ نزیـك یـا دوور

ئەگــەر بــەراورد کــەن ئێــوە
بڕواناکـــەم بـــەهیچ شـــێوە

نیــوەی نیــوی پێغەمبــەرتان
نـــازار هاتبێتـــە ســـەرتان

گــەر ڕێبــواری ڕێگــای ئــەون
هــەرگیز نــابێ زۆر بخـــەون

وەك ئەوبن ، ئیسلامی بەڕێز..
هــەڵبگرن بــە شــانازی و هێــز

گــوێ مــەدەن بــە ئــازار و ئـێش
هــەتا مــردن بڕۆنــە پــێش

بەهەشــتی خــۆش و فــراوان
نەکـەن بــە دونیــای دەن ئامــان

خـــودا زانـــا و شـــارەزایە
بـــەوەی لـــەناو دڵـــان دایــە

جــا ببنــە خوانــاس و بەنــدە
بـــزانن بـــەهاتان چـــەندە

پیــاو باشــە کــردەی بکێــشێ
تــا لــە دوا ڕۆژ ســەری نێــشێ

بـەڵام هـۆ خـوا ناسـانی ژیـر
ئـەوەش نـابێ بکـەن لـەبیر

دوژمنـــی پـــیس لەگـــشت لاوە
دژی یاســـا و خـــۆی ســـازداوە

هـەموو هێـزی خـستۆتە کـار
تـا نـەهێڵێ و بیبـا لـەبار

چـونکە ئێـوەی سـیما ڕۆشـن
وەکـو ئـەوان ئێـر نـا دۆشـن

دەسـا بـەدڵ تێبکۆشـن
تـا بـەکفن خـۆ دەپۆشـن

هەر بەهۆی ئەو ڕاستی و نورە
ڕوخسارەکە و سپی و سوورە

جـا وشـیار بـن ئێـوەی بـەڕێز
بەخـەبات و بـەرگری و هێـز

لـەدەوری ئـەو گوڵـە پاکـە
بوەسـتن کۆمـەڵ و تاکـە

دوژمنـان داخیـان لەدڵـە
دامـاون لـە دیـار ئـەو گوڵـە

جاهەر هەمووتان گرد و وورد
بەهیممەت بەرزی و دەست و برد

لەبۆ پارێزگاری کردن
ڕامەوەستن هەتا مردن

چونکە هەر ئەو گوڵە جوانە
خۆش بەختی هەردوو جیهانە

ئێوە ش بەخوێن گەر ئاونادەن
زۆر بێ وەفان شێتی جادەن

گیانیشتان وا لە سەردەستە
ڕەزامەندی خواو مەبەستە

سەربازی نادیار و وونن
شەپۆلی دەریای بێ بنن

بیلبیلەی دووچاوی منن
تەنگ بەزۆر داران هەڵچنن

٢٠٠٤/٤/٧

وجاهدوا في اللهِ حَقَّ جِهادهِ

# گەڵام زەرد نابن

زستان و پایز شان بەشان بەفر و باران دەبارێنن
بۆ سەر سەری منی زەیتون شاڵاوی ڕەش و توند دێنن

بەرچاوی تیشکی خۆری گەش لێڵ دەکەن و ئەتارێنن
بەڵام هەرگیز پێیان ناکرێ گەڵاکانم بوەرێنن

ئەو هەردوو هاوپەیمانانە هەموو ساڵێ وەکو هاران
دژ بەبوونی من سازدەکەن سەرما و سۆڵەو بەفر و باران

لافاوی لیتاوی دەکەن بۆ سەرم لەلادێ و شاران
بەڵام هەرگیز چۆك دانادەم وەکو زۆربەی زۆری داران

بەهارو هاوین دەزانن لەڕووی ئەوان چۆك چەقیوم
لەسەنگەری خۆ ڕاگری هەنگاوێکیش نەبەزیوم

چەقڵی تیژی چاوی تەنگی زۆرداری مێشك ڕزیوم
ڕاست و ڕەوا و سەرفرازی ئێرە و دونیا کەی ئەودیوم

بێ باکیشم هەتا ماوم بابزانن ئەم دوو وەرزە
ئەگەر ببنە گڕ و هێزی بورکان یاخود بومەلەرزە

لەدیار نەبەردی و خۆگریم دڵی ڕەشیان پڕ لەدرزە
دۆڕاوێکی بێ هیوانە منیش هەردەم سەرم بەرزە

٢٠٠٢/٤/١٨

# گەنجی بەڕێز

گـەر بزانــی چ ڕۆژێکـت چـاوەڕێیە گیانــە گەنجـە
برواناکـەم تـۆز قـاڵێ تـام بـچێژیت لـەلار و لەنجـە
بـەڕووتی ڕات نەوەستێنن ڕۆژێکی سـەختت لەپێشە
جا بۆچی هێنـده بـێ ناگای دڵـت بـەدنیاوە بەنجـە

گەر بەناگا نایەیت قوربان لەو ڕۆژە پڕ خەم و ئێشە
وەکو خەڵکی یاخی ملهوڕ دەگـەزیت هـەر هـەموو پەنجە
بــە پێــوەری ڕاســتی دڵــت ، کردەوەکانــت بکێــشە
هیودارم خۆت نەخەیتە ژێر باری ئـەو هـەموو ڕەنجـە

گیانـت بەچاوتروکانێك بـاڵ دەگرێـت و لەدەستـەدەی
لە پێناوچی سەرشێتانە مەیلت بەنەفسی مەست ئـەدەی
دەســتی مــردن زۆر درێــژە دەگاتــە بــن دەریاکــانیش
لەپێخەفی خەوی خامۆش خـۆت ڕزگـار بکە، هەستەدەی

ئەوەی بۆ خوانەبێ قوربـان بـێ بەهایـە و هاشووهوشـە
ئەگەر سەنگی هەندی کێو بـێ لەبـەردەمی بـا وەك پوشـە
هەڕەشـە و تۆڵەی خوداوەنـد گـەلێ بەسـۆ و ترسـناکە
بەو هیوایەم ڕزگـارت بـێ لـەم ئەزمونـە سـەخت و توشـە

٢٠٠٠/٥/٩

# خوشکی کراس کورت

خوشـکە گـەر کـەمێ مـردن لەهۆشـتە
زۆر شـەرمە بۆچی خـۆت ناکـەی پۆشـتە
لــەخوا بترسـێ هێنـدەت نــەماوە
چـیتر دەرمەخــە ئەوقــژ و گۆشــتە

هەڵسەوە لەخـەو خوشکی خـۆم بەڵکە
خــودا بتبــورێ دونیــا بــێ کەڵکــە
فــەرمانی خــودا بــۆ پێــشێل دەکـەی؟
تــاکو تێربکـەی حــەزی ئــەو خەڵکــە

لــچك لەســەر بــە هــە تــاکو مــاوی
جــوان و خــاوێنی بەداپۆشــراوی
گومانــت نــەبێ بــەخۆدا پۆشــین
لەگــەڵ ڕەحمــەتی خــوا تێکــەڵاوی

فــەرمانی خــودا بەڕاســت بزانــە
قــاچو قــۆڵ ڕووتــی داوی شــەیتانە
دژی خواوەنــدی لێــزان و بــەهێز
بــۆ دەبیــە داری دەســتی بێگانــە؟

بـــەر لـــەهاتنی ڕۆژی مەترســـی
واباشـــە ئێـــستا لـــە خـــۆت بپرســـی
هەڕەشـــەی خـــودا زۆر ترســـناکە
مەبـــە نێـــچیری خـــەڵکی چـــاو برســـی

ئـــەو خوشـــکانەی کـــە سەربەسەرپۆشـــن
زۆر ژیـــرو زانـــان بەهەســـت وهۆشـــن
کۆســـپی ســـەر ڕێگـــای چـــاو چـــنۆکانن
هـــەرگیز بـــە دونیـــا خۆیـــان نافرۆشـــن

٢٠٠٢/٧/١٤

# ولاتبرجن تبرج الجاهلية الأولى

# من مزگەوتم

مـن مزگـەوتم زۆر بـەرز و ڕێـز دارم
مـــالّی خواوەنـــدی پـــەروەردیگارم

لــەلای خواناســـان پــیرۆز و بـــەرزم
شـــوێنی تایبـــەتی ڕاوێـــژو فـــەرزم

بـانگی خواناسـی ڕۆژی پێـنج جـاران
ڕایدەگەیـــەنم لـــەلادێ و شـــاران

کاتـێ دەبیـستن (حـی علـی الـصلاة)
خواناسـان تێکـڕا بـۆ خێـر و خـەڵات

ئەگـەر کارێـشیان هـەبێ جێـێ دێڵـن
دەبنـــە میـــوانم بـــۆ چـــاکە وێڵـــن

میوانـــانی مـــن خـــودا پەرســـتن
لە کاتی بانگدان هەموو هەڵدەستن

بە گەرما و سەرما دێن ڕیز دەبەستن
شەیدای یەك تاکە هیوا و مەبەستن

ڕویان دەکەنە ڕووگـە یـان بـەخرۆش
بۆخـودای گـەورە دەکەونـەکڕنۆش

منـیش بــەدڵ و زۆر بەشــانازی
لەهەرهـەموویان دەکـەم پێـشوازی

ئـەوەی کــەدڵی بــەمن وە بەنــدە
هـەرخوا دەزانـێ کـە ڕێـزی چـەندە

کەسـێکیش بـەمن گـەر نـەبێ ڕازی
بــەبون و بــەختی خـۆی دەکـا وازی

ئەو قەدر و ڕێزەش خوا لەمنی ناوە
هــەر ڕێزداریـشم تــا دونیـا مـاوە

خــەڵکێکی زۆرم پــەروەردەکردن
دووره پــەرێزی ڕەفتــاری وردن

پــەتی نــەمانیان بکرێتــە گــەردن
پاشــگەز نابنــەوە لەترســی مــردن

چونکە شوێنێکی زۆر ڕاستەقینەم
بنکە و خوێندنگای ئەوشازە دینەم

بۆیە لەکاتی هەڕەشەی کوشتن
دەرگاکانی من هەر لەسەرپشتن

زمانم هەردەم بەبانگەوازە
بۆ پێکهێنانی نەوەی نوێ و تازە

تا بەرگری بکەن لەم بانگە پاکە
بانگی بەرنامەی خواوەندی تاکە

ئەگەرچی دوژمن هەر هەمووکاتێ
بەچاوی پیسی سەیرم دەکاتێ

بەلام بێگومان سستی نانوێنم
یەکتا پەرستی ڕادەگەێنم

٢٠٠٤/٧/٢٦

وأن المساجد لله فلاتدعوا مع الله أحدا

# یاسای قورئان

موســـوڵمانم تێدەکۆشـــم بـــۆ ڕێبـــازی بـــەرز و پـــاکم
ڕووم لـە لوتکـەی سـەرکەوتنە نەترسـانە زۆر بـێ بـاکم
هـەموو توانـام نەخەمـە کـار تـاببینم بـە چـاوی سـەر
قورئـانی خـوای بـەرزو بـەهێز دەبـێ بەیاسـاو بـەحاکم

ئەگـەر قورئـان حـوکم بکـا دەبیـنین لـە هـەموو لاوە
بەختـــەوەری و برایـــەتی پەڵـــە دەدا و دێتـــە کـــاوە
داری بێبـەر دەبنـە بـەردار لـەنوێ بنیـات ئەنرێتـەوە
ئـەو دڵـەی کەچـەندین ساڵە وێرانـە و بۆتـە کـەلاوە

وەك قورئـــانی پـــڕ لەڕاســـتی کەســـێ نیـــە کـــە بتوانـــێ
هـــەموو کەســـێ بـــەدادوەری بهێنێتـــە دەوری خوانـــێ
دادوەری پـڕ لـەدانایی وەکـو قورئـان دەسـت ناکـەوێ
دەبا بینێینە سەر سەرمان لە دوای ماچ و دەست لەملانێ

دەسا هەموو با بەیەك دەست لـە ڕێـی قورئـان تێبکۆشـین
سـستی نەکـەین لـە تێکۆشـان تـا بـەکفن خـۆ دەپۆشـین
لـەبۆ دونیـای کـەم و کـاتی بـۆ خـوا لـەخۆ بـڕە نجێـنین؟
زۆر نـەماوە خۆربێتـەوە هەتاکـەی هـەر نێـر بدۆشـین

٢٠٠٢/٩/١٩

# دڵی من

هۆمەلیکی مەملەکەتی دڵی من
ڕێگات خۆرە بۆتاریکی گڵی من
لەبەردەمی گێژەلۆکەی ترسناک
خۆڕاگرن پەرەکانی گوڵی من

هەر دڵێك بێ بەویستی تۆ بوێر بێ
بەبارانی بەزەیی تۆوە تێر بێ
وەکو قەڵای پۆڵا یینە بێ گومان
زۆر ئەستەمە بترازێ ، سەر و ژێربێ

ئەو دڵەی من پڕ لەڕاستی و نور بکەی
لە ناپاکی و چۆك دادانی دوور بکەی
تا شەمشەمەکوێر هێلانەی تێنەکەن
لەدوارۆژیش سەربەرزو ڕووی سوربکەی

خۆر و مانگی تێهەڵبێنە تا یەك جار
گورگ و چەقەڵ لەسەر کورسی بێنەخوار
چونکە موڵك و مەملەکەتی وان نییە
دەبێ ڕاستی تێی ببێتە تاکە سوار

٢٠٠٢/٥/١٦

# دڵنیـــابە

ئێمە ئەگەر خوامان بوێ , لە هەڵوێستی کوفر دووربین
نابێ بژین لە تاریکی دەبێ هەردەم ئاشنای نور بین
نەوەستانی بەبێ وچان هەرگیز نابێ فەرامۆش کەین
هەتا دواین تکەی خوێنیش دەبێ لەسەرخەبات سوربین

کوفریش ئەوهێزەی هەیەتی بەئاشـــــکرا و بە نهێنـــی
خستۆتیەکار بۆ سەر سەرمان بەشێوەی زۆر شاڵاو دێنی
دە بڕوا کەن بڕوا داران دوژمنی شێت و ملهورمان
ئەوکات دڵی دادەمرکێت ئەگەر لەڕەگ دەرمان بێنی

شەو و ڕۆژ لە ژێر سەریانە ئەم هەڵوێستە لەکۆنەوە
لە هەرکاتێ دەمانبینن بەسسیلەی چاوی مۆنەوە
چونکە زۆر زۆر داخ لەدڵن , ئەگەر بکرێت دەیانەوێ
جامی سەرمان لێك بدەن و خوێنمانی تێ بخۆنەوە

ئەوانەجێی موتمانە نین هاوشێوەی خەلکی خەیبەرن
ڕوخێنەری ماڵی خوانە دڕکی سەر ڕێ و دەردی سەرن
هەتا ماون یابمێنن هەر خاوەنی ئەو هەڵوێستەن
تینووی خوێنی ڕێبوارانی ڕێگای خودا و پێغەمبەرن

شەرمە ئێمەش بەفیتی وان هەریەکە و ڕوو لەلایەکین
کە لەخوا دەپارێینەوە هەریەکە و بەهیوایەکین
بەڵام باشە یەکدی بگرین دژ بە هەموو بەدڕەوشتی
چونکە ئێمە موسوڵمانین براینە بەندەی خوا یەکین

# ڕێبـــازی خــوا

ئەی خوایە گیان منی بەندە ڕێبواری ڕێگاکەی تۆمە
بەقەدمونێك گەر لێی لادەم سەرگەردان و ڕەنجەڕۆمە
لالوتی ئەم ڕێیە ناکەم بێ باکانە گرتۆتمە بەر
گەر ونیش بم لەگێژاوی هەڵبەستە و ناتۆر و لۆمە

ئەگەر جێگا و ڕێگا و بانم لەسەر پشتی هەور و مانگە
وەکو کەڵ و شێریش ژیابم ئەم بینی بێ ژیانی دانگە
بەیەك عانەی قەڵب و سوتاو ئەگەر لەڕاستی لامدابێ
چونکە تەنها بەرنامەی خوا ڕەواترین ڕاستی و بانگە

ڕێبازی خوا شەقامێکە ڕێبوار تێیدا زۆر گەشبینە
لێ لادانی ترسناکە دەور و پشتی هەموو مینە
جا خۆش بەختی وسەرفرازی لە بۆ هەموو ڕێبوارانی
دڵنیامە لە هەردوو ڕۆژ هەر ئەوانن ڕاستەقینە

بێگومانم ڕێگای ڕاستی و سەرکەوتنە ئەو ڕێبازە
ڕێگاو ڕێچکەی دەست کردنیە جێی هیوایە پڕ نیازە
گەرخۆت بە ڕێبوار دەزانی هەرگیز دەس بەرداری مە بە
خۆت لەگەڵی تێکەڵاو کە هۆ ئەوەی ئەترس و تازە

٢٠٠٢/٩/٢١

# فـــیز

سـڵاوی خـودای لەسـەربێ پێغەمبـەری لـەدڵا ئـازیز
فەرموویەتی گەر هەرکەسێ لەدڵی دابێ تۆزقاڵێ فیـز
لە ڕۆژی پاداشت و سزا زۆر مەحاڵە هەرگیز هەر گیـز
بەرەو بەهەشتی نەبڕاوە لەگەڵ خـەڵکان ببەستێ ڕیـز

قەت خۆت بەگەورە مەزانـە ڕووی لوتیشت مەکە سەرێ
ئەگەر گوڵیش فیزی هەبێ بێ شـك پـەڕەی هەڵ ئەوەرێ
هەر فیز بوو ڕێی نەداشـەیتان کڕنـۆش لـەبۆ ئادەم بـەرێ
خوای بـەهێزیش لـەناو ڕیـزی فریشتانی کـردە دەرێ

لوت بەرزی و فیز نارەوایـەجا هەرکەسێ کەهۆش مەنـدە
خۆڵـە و دەردە دەپـارێزێ دەزانـێ کـەزیانی چـەندە
خۆهەڵ کێشان هـۆی هەڵسانی ڕق و خـەشمی خوداوەنـدە
جاچۆن خودا دەرەنجێنێ کەسێ خۆی دانـێ بەبەنـدە؟!

لە خوایەتی خوا بترسێ مەکە بـەگوێی ئـەو ئیبلیـسە
لەسەر فیز نەفرەتی لێ کـرا , ئـەو دوژمنـە هـەناو پیـسە
ڕێی ڕاسـتیت لـێ دەشـێوێنێ بەهەشـتت دەبـا لەکیـسە
(واعتـصوا بحبـل الله) دەسـت بەرنـەدەی لـەو گوریـسە

ئـەو دڵـەی کـەدەردی فیـز و لـەخۆبایی چـۆتە نـاوی
خۆی بەگـەورە دەزانێـت وخـەڵکی سوك دێنـە بەرچاوی
پەتایەکـە و خاوەنەکـەی بـەهۆی فیـز و نـاز و بـاوی
کەوتۆتە ناو فێڵی شـەیتان ئەسـتەمە بـەربێ لـەداوی

# برای بێ ئاگا

بـرای کەسـاس و دامـاو ئاکـەی بـێ هـۆش و مەسـتی
کەوتویە داوی دونیا و دەستت ناوەتـه نـاو دەسـتی
چاکەی خوا بێنە بەرچاو شـەرمە مەنوێنـە سـستی
لەچاکەی چاکەی چاکی بۆچی جوان نـای پەرستی

بۆچـی لەڕاسـتی دەرچـوی خـۆت کـردوە فـەرامۆش؟
بۆ خۆت نەزان کردووە چیە تـۆی خـستۆتە جـۆش؟
دوربین و ژیر و زۆرزان وەکو ناکەسی بێ هـۆش
لـەپێناو دونیـا هـەرگیز ڕاسـتی ناکـەن پـەردەپۆش

خـوای گـەورە لـە نـەبوونی ئـەتۆی هێنایـەکاوە
بـۆتی ڕوون کردۆتـەوە کـام ڕێگـا تەڵـە و داوە
تـاکو خـۆت تـێ نەچـوێنی سـۆزی بـۆت بـەربلاوە
ئەگـەر چـی تـۆش بـێ ئاگـای دونیـا فریـوتی داوە

لـە خـەوی بێ هۆشـی دا هیـوام وایـە تـۆ هەسـتی
تـاکو وون نـەبووی لـەناو گێـژاوی خـەم و پەسـتی
بـەرەو هەڵـدێرت دەبـا خـۆت ڕزگـار کـە لەدەسـتی
هـەتا شـەرمەزار نـەبووی بێداربـەوە لـە مەسـتی

٢٠٠٢/١٠/١

# هەر دەمرین

هەزاران ساڵ ئەگەر بژیت بەبێ خەمی بەڕابواردن
دڵنیا بە دەبێ بڕزی بۆ کرم و خاك ببیە خواردن
کەسی لە تۆ لێهاتوو تر بێ ئاگا بوون تا لە ناکاو
مردن تەنگی پێ هەڵچنین بەردو گۆڕی تاری ناردن

ئەگەر ژیری بیر بکەوە لەو کەسەی کە وا مردووە
لە پەشیمانی بەولاوە چیکەی لەگەڵ خۆی بردووە؟
تۆش پەشیمان دەبیتەوە , ئاگادار بە ئەی براکەم
لەئێستاوە تەوەبە بکە بگەڕێوە هەتا زووە

ژین بۆ هیچ کەسێ نەماوە هەتاکو بۆ تۆ بمێنێ
گەر نۆرەت هات ئەو مردنە لەڕیشەوە دەرت دێنێ
ڕزگارت نابێ لەدەستی ئەبڵەق دەکا چاوەکانت
وەکو پایز زەردت دەکا گەڵا کانت ئەوەرێنێ

دەسا دڵت بەچی خۆشە بەندەی بێ وەفا و بێ شەرم ؟
کە دڵنیای دەبێتە گڵ سەرین و پێ خەفی گەرم
جوانی و لاوێنیت باڵ دەگرێ بەرەو شوێنێکی نادیار
ئەوکات پەشیمان دەبیەوە و دەڵێی: سەدجارخاك بەسەرم

٢٠٠٢/١٠/١

# بێ گومان

ئەگـەر خواردنمـان ئـاو لەگـەڵ جـۆ بـێ
هـــەموو ژینیـــشمان زاری و ڕۆ ڕۆ بـــێ
گـــەلێ باشـــترە نـــەوەك چـــاو ســـاغمان
قـــەلی ڕووڕەش و کونـــدە بـــەبۆ بـــێ

ئەگـــەر بپرســـین لـــەخۆی بـــێ مێـــشك
داری دەســـتانین ئێمـــە بـــەبێ شـــك
هـــەر بۆیـــە دوژمـــن ســـوار و ڕاوکـــەرە
بـــەخۆشمان ئەســـپ و تـــاژی و کەروێـــشك

بـــەڵام تـــا ڕێـــوی لـــەجێگای شـــێرە
چـــەقەڵ و گـــورگ زگیـــان هـــەر تێـــرە
چاوساغیش قـەل بـێ یـان کوندەبـەبۆ
بـــە بـــاز دەوتـــرێ شەمـــشەمە کـــوێرە

٢٠٠٢/٤/٦

# قـورئـــان

هـــۆ قورئانـــە پیرۆزەکـــەم بـــەڵێن وابـــێ تـــابمێنم
تـۆی ڕونـاکی ڕێگـای ژیـنم بـەرێزەوە هـەر دەتخـوێنم
ڕێگـات بـۆمن ڕوونکـردەوە فێـرت کـردم بەناسـانی
گـوڵی بـۆن خـۆش بنێـژم و دڕکیـشی لـەڕۆخ دەرێـنم

خوای بەهێز و باڵا دەست و زۆر بـەتوانا و پـەروەدیگار
ویـستی ڕونـاك بکاتـەوە شـەوە زەنگـی شـێواوی و تـار
ئـەو قورئانـە پـڕ لـە پەنـدەی لـەبۆ پێغەمبـەری بـەرێز
لەبـەرزایی حـەوت ئاسمانـان وەکو خـەڵاتێ نـاردە خـوار

قورئانـــە ڕێنمایەکـــەم تیـــشکی خـــۆر و مانگـــە شـــەوی
بـۆ هـەموو مرۆڤایـەتی مـوژدە بـووی هاتیـە سـەر زەوی
نـاو دەلاقـەی دڵـە جێگات منـی نوستو بـەهۆی تـووە
بەرەو لوتکەی سەرکەوتن چووم لەژیانێکی نـزم و نـەوی

٢٠٠٢/١٠/٥

إنَّ هذا القرآنَ يَهدي لِلَّتي هي أَقوَم

# کەسی بێ ویژدان

خەڵکێك هەیە بەناو چاکە کار بەدەستە زۆر شاکارە
ئەگەرلەپشت حەوت کێوان بێ کەسایەتی هەر دیارە
بۆ هەردوولا هەڵدە ڕێژێ لەڕواڵەتیدا مشارە
گەچی هەردەم لە پەنادا هەر وەکو دڕندەی هارە
لە پێناوی سەقامگیری حەزە چەوت و ڕەشەکانی
زۆر ئاسانە بە تێکڕایی خەڵکی بدا لە سێدارە

٢٠٠٤/٤/٩

# پێویستە

ئەی ئەو کەسەی هەوڵ دەدەی یاسای قورئان بەر قەرار بێ
ئەگەر بوونت وەك مانگ و خۆر لە هەموو دونیاوە دیاربێ
لە ڕۆژی لێ قەومانیشا هێز و ورەت بەخت و یار بێ
بەڵام ئەگەر لەسەر ڕێگات گورگ و ڕێوی و سەگی هار بێ
زاریشیان دژ بە یاساکەت پڕ لەتوانج و زەهری مار بێ
دەبێ تفەنگت هەر لەدەست بێ گەر گوللەشی بەرد و دار بێ

٢٠٠٣/٣/١٥

# گەنجی نەزان

ئەی گەنجە تاکەی مەست و کەساسی
دۆستی خراپەی چاکە ناناسی

بپرسە لەخۆت بزانە تۆ چی؟
خواوەندی گەورە تۆی داوە بۆچی؟

لالوتی مەکە بەرپێت ببینە
تا سەر بۆ هیچ کەس نابێ ئەو ژینە

تاکەی تێناگەی؟ مەست وبێ هۆشی
هەڵە دەردەخەی ڕاستی دەپۆشی

ئەگەر بیر بکەی لەو خوایە تاکە
چەندە بەهێز و بەرز و بێ باکە

چیت بەسەر دێنێ لەژێر ئەوخاکە
بۆی ئەنجام دەدەی کرداری چاکە

ئەی گەنجە چونکە ڕاستی نەناسی
بۆیە بەخراپە شایستەی باسی

تاکەی لە ئاستی ڕاستی بەفیزی
دۆستی شەیتانی لە خواوەند زیزی

گەنجی وا هەیە بێ ئاگا و سەرخۆش
تا ئێستا بۆ خوا نەچۆتە کڕنۆش

لەسەر شەقامان بڵندە لووتی
بە کابۆی تەسك مل و قۆڵ ڕوتی

هەرچەند یەك دونیا حەزی لەکۆڵە
هیچ کارێك ناکا گیرفانی چۆڵە

ئەنگوستیلەی زێر دەکاتە پەنجە
پێی وایە هەر ئەو لێهاتوو و گەنجە

ملوانکەی زەردی لەمل و لەدەستە
ڕای دەوەشێنێ بەلاوك و بەستە

ئەگەر بکرێت ئەو خەجاڵەت بارە
لەگوێیەکانی دەکا گوارە

ڕوخساری زەردە جگەرە کێشە
زمانی پیسە زۆر دەم لەپێشە

لە ئاستی باوك و دایکیشی ڕەقە
ئەوی پێ هەڵەن هەر خۆی پێ حەقە

قسەی نابەجێ و سوکیان پێ دەڵێ
دایك و باب دەبێ بەو بڵێن بەڵێ

هـەر کارێـك ئەگـەر خـوا بـڕە نجێنـێ
سـەرقاڵی بـەدخو بەچـاك دەیبینـێ

پێی وایـە قیامـەت گـەر هەشبێ دوورە
هەربۆیـە لەسـەر دڵ ڕەقـی سـورە

زۆر خەڵکی وەك ئەو نـەما بـە گەنجی
دڕك و زیـوان بـوو بەرهـەمی ڕەنجـی

وابـا شـە بـۆ خـۆی بـیر بکاتـەوە
دڵو دەروونـی چـاك بـشوا تـەوە

بـەناوی پـاکی پەڵـەی خـودایی
بەڵکـە لـەدونیا یـاخود لـەدوایی

خواوەنـدی گـەورەی بێ هاوتـا و بـەهێز
سـەرکەوتووی بکـا وە لێـی بگرێ ڕێـز

٢٠٠٥/٣/٢٤

# سپڵەیی

شەرم بکە هۆ ئەو کەسەی کە مان و مردنت ژانە
لەدوای خواردن خوان دەدڕێنی توخوا ئەمە کەی ویژدانە؟
هەتا دوێنی گەسکی ماڵ بووی بۆ ئەمڕۆ بووی بەبێگانە؟
گەر ڕابردووت بێنیە بەرچاو هەرگیز لەخان نادەی تانە
بەحریش بەدەم سەگ پیس نابێ پەندی ڕاستی پێشی نانە

بێ ئەمەکی و بێ وەفایی باوی مرۆڤی نامەردە
گەرسپڵە و بێ وەفا دەرچووی دەبیە گورگ لەپاش پەردە
ئەگەر بەخۆت دابێیتەوە بویتەداری دەستی جەردە
جا ئەی ئەزان تا جڵەوت لەدەست خەڵکی دڵ بەدەردە
ئەوکانیەی لێی دەخۆیتەوە دەبێ تێی کەی هەرچی بەردە

٢٠٠٠/٧/٢١

# خوشکی بێ ئاگا

خوشکی بێ ئاگا هەستەوە لەخەو
کاتی خەو ڕۆیی تێلەی پێچا شەو

مەچوە ڕێبازی خەڵکانی چەپ ڕەو
هەرگیز گوێ مەگرە لەقسەی ئەمو ئەو

ئەمڕۆکە ڕۆژی زانینی حەقە
هەتاکەی دڵت وەکو بەرد ڕەقە

بۆ هێند سەرقاڵی تۆ بە دونیاوە
دونیای بێ وەفا وەکو کلاوە

یەك یەکە خەڵکی لەسەر یان ناوە
بەلام هەتا سەر بۆ کەس نەماوە

لە بۆ دوا ڕۆژیش کێلگەی بەپیتە
ئەگەر چی ئەتۆی خستۆتە لیتە

گەر خۆت دەرناکەی لەو لیتە چیرە
دەبێتە مایەی شیوەن و زیرە

ئینجا بیرکەوە لەگۆڕ ئەی خوشکە
گۆشت و لاشەکەت بۆ کرم و مشکە

ئەگەر تەمەنت ڕێك هەزار ساڵ بێ
هەر دەبێ ژینت لێ تفت و تاڵ بێ

مردن فەرمانى خواوەندى زاڵە
هەر هەموو گیانێك ئەم تامە تاڵە

یەك جار لەژیانى دەبێ بنۆشى
ئینجا بەزۆر بێ یاخوود بەخۆشى

جاتاكەى چەكى دەستى تاغوتى
بەقسەیان دەكەى بێ بەرگ و ڕووتى

مەچووە ڕێى هەڵە و ئارەزووبازى
تاوەكو شەیتان پێت نەكا وازى

ئەگەر لە بەدكار بكەى پێشوازى
لەڕۆژى دوایى دەكەویە تازى

لەپێناوى چى هێند فەرامۆشى ؟
بە قسەى شەیتانان بەران دەدۆشى

دەفەرمووێ خوداى (رب العالمين)
( إنه لكم عدو مبين)

تۆش بكە بەقسەى ئەو كردیگارە
شەیتانى بەدخو دوژمنى دیارە

گەلێ ئافرەتی نەزان و بیر پیس
ببونە داردەست بۆ دونیا و ئیبلیس

دەیان وت : سەرپۆش لەکوێ پۆشاکە
دەستوری ڕووتی باشتر و چاکە

بەلام لەناکاو ڕەشەبا ی مردن
وەك پوش و پەلاش ڕاپێچی کردن

ئێستا وا لە ناو گلکۆێ تارن
خۆراکی کرم و دووپشك و مارن

ئازار ئەچێژن سالەهای سالە
لەدەست تۆلەی خوا دەرچوون مەحالە

بزانە هەرچی هاو بیری وانن
شەمشەمە کوێرەی نیوەی شەوانن

بستێ بەرچاویان هەرگیز نابینن
دوژمنی تیشکی خۆری زێڕینن

جا ئەی ئەوخوشکەی کەوا گوێت لێیە
بزانە سەرپۆش دەستووری کێیە

ئەگەر ژیرانە خۆت دابپۆشی
لەڕۆژی دوایی دەکەویە خۆشی

لەسەر سفوری و ڕوتیش گەر سوری
لە هەردوو دنیا لەخواوەند دووری

جا هیوادارم کە وا تۆی بەندە
ببیە بەندەی چاك بۆ ئەو خواوەندە

وەکو نەزانان خۆت مەدۆڕێنە
ببە ڕووناکی شەو بتۆڕێنە

٢٠٠٢/٨/١٨

# ولاتبرجن تبرج الجاهلية الأولى

# بەناچاری

دەروونــی لای چـاکە خــوازیم تاســاندمی وتــی هەســتە
تــاوان و سەرپێـچی زۆرن لـەناخی دڵـی تـۆی خەســتە
پەڕەی گوڵی تەمـەن سستن گـەر هۆش و ژیریـت زینـدووە
تەنها تەوبە دەگرێ بەرگەی ئـەو هـەموو کۆسپوبەربەسـتە

منـیش کەبێـدار بوومـەوە هـاوارم کـرد ووتم ئـەرێ
کەسـێ نیـە ساتێکیش بـێ کۆڵـە خـەمی مـن هـەڵگرێ
کەچی هیچ کەسێکم نەدی بەزەیی کا بـە حاڵی مـن
بـەڵکو کزۆڵـەی وەکـو مـن بـەزۆر ئـەیان کـردە دەرێ

ئـیتر پیریـش ڕووی تـێ کـردم وا دەسـتەکانم ئەلـەرێ
سپی بـاڵی کێـشا سـەر ڕەش ، تـووکی سەریـشم ئـەوەرێ
گـوڵی هیـوام پـەڕەی ئـەما گـەڵا ڕێـزان نزیـک بـۆوە
دەبـێ هەسـتم بەناچـاری ڕوو کەمـە دەرگاکـەی سـەرێ

٢٠٠٢/٣/٧

# بەرزی خـوا

خوایـە گیـان هانـا هـەر بـۆ تـۆ دێـنم
بـە تـەنها بـۆ تـۆ سـەر دائـەنوێنم

خوایـەکی گـەورە و بـەرز و بـەهێزی
هـەر تـۆ شـایەنی کڕنـۆش و ڕێـزی

هەرتۆی باڵا دەست گەورەی گشت گەوران
بە فـەرمانی تۆ ئاودێت لە هـەوران

هـەر دانـانی تـۆ لـەجێ و تـەواوە
ئـەوی تـر وەکـو بـەفری بـەرتاوە

زانـا و بـەهێزی زۆر میهرەبـانی
بـە دیـار و نادیـار هـەموو دەزانـی

بەبێ مۆڵەتت هـەرگیز هیـچ جارێ
گـەڵا لـەداران ناکەونـە خـوارێ

چـونکە باشـترین پـەوەردیگاری
بەهـەموو شـتێك چـاك ئاگـاداری

جا بابزانن هەموو ئەو خەڵکە
هەر ڕێبازی خوا بەسود و کەڵکە

ڕێگا و ڕێبازی خوای گەورە و لێزان
خۆشحاڵمان دەکا لەڕۆژی میزان

هەرکەس پێشێلکا فرمانی پاکی
بابزانی بۆ خۆی بە باش و چاکی

مەست و نەزانی گێل و سەرکەشە
خەجاڵەت بارە هەردوو ڕووی ڕەشە

لەهیچ کاتێکدا خواوەندی بەهێز
سەیری ئەو ناکا بە بایەخ و ڕێز

لەدوا ڕۆژیشا ڕووت ئەی وەسێنێ
بە ئاگری دۆزەخ چاك ئەیسوتێنێ

جا نەکەن بگرن ڕێگای نامەردان
نەکەن سەر بدەن لەکێو و بەردان

هەر کەس وا بکا گێل و سەرقاڵە
ئەگەر لە پیری بوبێتە ، خاڵە

تاوەکو دونیاش ماوە و بمێنێ
کیسەڵ پێی ناگرێ کێو بڕوخێنێ

گەرچی خەڵکێکی کۆڵان و جادە
پەروەردەی دەستی ڕەشی (ئیلحاد)ە

کوڕی داوێنی پیس و ناپاکن
دژی ئیسلامی ڕاست و ڕوناکن

بە زمانی لووسی پڕ چەنەبازی
پێشنیاز دەکەن بۆ خوا و ڕێبازی

دەڵێن : ( گەر ئێمە ببین بە قازی
قورئان نەمێنێ , ڕۆژگار دەنازی

چونکاتی ئیسلام باوی نەماوە
هەموو مافێکی بەچاك نەداوە

•

پــەیڕەو كــەرانی كۆنــە پەرســـتن
دژی فێــر بــوون و داد و زانـــستن )

گوایــە ڕای ئــەوان باشـــترین حەلــە
چارەســـەری گــشت جیهــان و گەلــە

جـا ئەگـەر ڕاسـتە ئـەوانی سـەرقاڵ
ئـەوانی مەست و بیر و هۆش بـەتاڵ

ئەگــەر لــەقورئان باشــتریان پێیــە،
داك و بابیــشیان دەناســـن كێیــە

دیــارە زۆر مـــەردن مرۆڤــی ئـــازان ،
ئەگەر چی هیچ شت ناگاتـە قورئـان

چــونكە ئەوانــەی ئــەوە دەبێـــژن
لــە ڕاســتی دوورن بــێ فــام و گێـــژن

ســەگ و بــەرازی لاشــە بــێ نویــژن
بـــەخۆر دەوەڕن , زمـــان درێـــژن

خـۆری ڕوونـاکیش ڕوونـاکی پێیـە
گەرچـی نـەزانان ڕقیـان زۆر لێیـە

چونکە هاوشێوەی شەمشەمە کوێرن
دۆسـتی تـاریکی و دوژمنـی خێـرن

جـا هیـوادارم ئەوانـەی وانـە؛
دوورن لەڕاسـتی و دوژمنـی خوانـە

چیتر ڕەق نـەبن وەك بـەرد و ئاسـن
ڕەش و سـپی لـێکتر دەرکـەن ، بناسـن

٢٠٠٥/٢/٢٨

# لیس کمثله شيء

# کچ بەپارەدان

نیـاز و مەبەسـت و ئامـانج لـەم باسـە
دایــك و بــابێکی ڕاســتی نەناســە

هیـواو ئاواتیـان بـەس پـارە و پوولـە
پـارە ڕاودەکـەن وەك تـاژی و توولـە

بـەڵام خوایـە گیـان ئـەو بـاب و داکـە
دڵیــان بگــۆڕە بــۆ خێــر و چــاکە

ڕەفتاریــان بــەدە کــچ بەشــونادەن
وێــڵ و تامــەزۆی ســامان و مــادەن

کـچ وەك کـوڕان نـین وشـیاربن، ئـەرێ
وەك و گـوڵ وایــە زوو هەڵئــەوەرێ

کــچی وا هەیــە ئەوەنــدە پــیرە
ســاڵی گرانــی گــەورەی لــەبیرە

لـە دەسـتی داك و بـاوکی سـەرقاڵی
هــەموو تەمــەنی پــڕە لــەتاڵی

شـو نـەکردنی ئـەو کـچە ئـازدارە
هـۆی ئەمـە نیـە خـراپ و بـەدکارە

کــردە و ئاکــار و هــەموو ڕەوشــتی
جــوان و خــاوێنن تێکــڕا بەگــشتی

بــەڵام بابەکــەی بــەد و زۆردارە
لــە خــەڵکی دەکــا داوای زۆر پــارە

نایدابــە کەســێ زۆر پــارەی نــەبێ
کۆشــك و تــەلار و ســەیارەی نــەبێ

کەســانی ئــەوها نیــاز بــەرازن
خــەڵك نــاتوانن کــچیان بخــوازن

ئەو کچە داماوەش هەڵناستێ بەختی
لەژێر ویــژدانی بــاوکی سەر سەختی

جــا هیــوادارم خوایــە لــەتۆی تــاك
داك و بــابی وا ببنــە خــەڵکی چــاك

تــاکو لــەپێناو پــڕ بــوونی گیرفــان
کــچیان دانــەنێن لــەڕیزی حــەیوان

چــونکە کــاری خــوا لــەجێ و تــەواوە
ڕێــزی لــە ئــەوەی ئــادەمی ئــاوە

چ نێربــێ چ مــێ بەنــدەی بــەڕێزن
بەندەی خواوەنــدی گــەورە و بــەهێزن

بــەڵام کامــەیان ڕەوشــتی چــاکە
ئــەو نــزیکترە لــەو خوایــە تاکــە

ئینجــا زۆر شــەرمە ئــەوکارە کەمــە
حــەیا وەك ئــاوە ، پێــیَ مەکــەن گەمــە

بۆیــە ئەوانــەی بــەو ڕەنگــە وانــە
لــە ڕاســتی دوورن , دوژمنــی خوانــە

درۆوون زامــداری بــیَ کــەڵك و هۆشــن
کــچیان بــە مــاڵ و پــارە دەفرۆشــن

هەرکەســیَ ژیــر بــیَ ناکــا ئــەو کــارە
دیــن و قیامــەتی نــاداتە بــەپارە

بــەڵام کەســیَ وا هیــوای ســامانە
گــشت شــتیَ دەکــا لــەپێناو عانــە

کــچێکی خــاوەن ڕەوشــتی ، ســەرپۆش
دەیداتــە یــەکیَ نابــەجیَ و ســەرخۆش

ســەیرە ئــەو باوکــە چــۆن دڵــی دێڵــیَ؟!
خــودا ڕووی ڕەش کــا وەك بــەری ســێڵیَ

ئەگەر ئەو باوکە لەخۆی ناکا فێڵ
چۆن کەر دەدۆشی لەجێی مەڕو چێڵ

شیربایی چڵکی دەستی ئیبلیسە
ئابڕوتان مەبەن بەو ماڵە پیسە

من دوعادەکەم هەر کەسێ وابێ
یان چاك بێ ، یاخود تووشی بەلا بێ

هەندێ باب هەنە زۆر کار ڕەنگینن
لەزاری ڕاستی شیلەی هەنگوینن

خاوەن هەڵوێست و بڕوای بەهێزن
سنوری خودا ، چاك دەپارێزن

هەرگیز کیژانیان ناکەن بە کۆنە
چونکە دەزانن سزای خوا چۆنە

لەپێناو خودای گەورە و کردگار
دەی دەن بە خەڵکی ژیر و بڕوادار

باوکانی ئەوها بڕوا بەتینن
بەچاوی دڵیان قیامەت دەبینن

٢٠٠٢/١١/١٦

## نوێژنەکەر

هــۆ کــاکی مەســت و بــێ هــۆش
دۆســـتی هەڵــە و ڕاســتی پــۆش

پێــت دەڵــێم بــە قــسەکی خــۆش
لــە بــۆ خــوا ببــە کڕنــۆش

زۆر شــــەرمە , شــــەرم ناکــــەی
پـــشت هەڵدەکــــەی لەچـــاکەی

بۆچــی بــۆ خــوای بــەرزو تــاك؟
ســـەر دانانێتـــە ســـەر خـــاك

ئەگـــــەر ژیـــــر و لێزانـــــی
هـــــەر بەنوێـــــژەوە جـــوانی

چـــونکە فـــەرمانی خوایـــــە
لەســـــەر شـــانتی دانایـــــە

کـــــە فرمـــــانی خواوەنـــــدە
بزانـــــە بـــــەهای چـــــەندە

جـــا ئەگـــەر ژیـــر و مـــەردی
ســـەرت بـــۆی دانـــێ عـــەردی

تاکـــــەی نـــــالۆدەی دەردی؟
وەك گـــــەڵای پـــــایز زەردی؟

خـوای خـۆر ئـاوا و خـۆر هـەڵات
کردۆتیـــــە ئـــــەرك (صـــــەڵات)

تــــۆش بەچـــاکەی ببینــــــە
چـــونکە کۆڵەگـــــەی دینـــــە

ئینجـــا نـــاوی خـــوا بێنـــە
تـــام دەبینـــی لـــەم ژینـــە

ئەگـــەر نوێـــژ ئـــەنجام نـــادەی
شـــێتی کـــۆڵان و جـــادەی

سنـــــووری مـــــە بـەزێنــــە
جـەهـەنـــــەم دڵ تـەزێنــــە

ئەگـــەر سـەر بـۆی نـــەنوێنی
پەنجـــەی خـــۆت دەگـــەزێنی

خـەڵکێکیش هـەبوون گێـژ بـوون
ڕێبـــواری ڕێگـــای لێـــژ بـــوون

دڵ تـــاریکی بەفرێـــژ بـــوون
گـــلاوی بـــێ دەســـت نوێـــژ بـــوون

زۆر دوور بـــوون لەنوێـــژ کـــردن
لەچـــاکە و کرنـــووش بـــردن

کـــە گیانیـــان گەییـــە گـــەردن
بوونـــــە نێـــــچیری مـــــردن

بـــەرەو گـــۆڕی تـــەنگ و تـــار
هـــــەڵومرین وەك گـــــەڵای دار

پـــشتیان کـــرد لـــەلادێ و شـــار
بـــەجێیان هێـــشت کـــەس و کـــار

بوونـــە توێـــشوی مـــشك و مـــار
پیرۆزیـــان بـــێ هـــەزار جـــار

گـــوێ نەدەیتـــە ئەفـــسانە
نوێـــــژ نـــــەکردن تاوانـــــە

جـــا ئاگاداربـــــە گیانـــــە
دوا ڕۆژەکـــــەت وێرانـــــە

گـــــەر نـــــازانی بزانـــــە
تـــا ســـەر نیـــە ئـــەو مانـــە

ئـــەی هـــەناو ڕەش وەك ماســـی
بگـــــرە ڕێگـــــای خواناســـــی

دونیـــا مـــولکی کـــەس نیـــە
هەرچـــەند بکـــەی بـــەس نیـــە

زۆر قـــــارون و فیرعــــــەون
مـــردن کردنـــی بـــە خـــەون

نوێـــژ نـــە کـــەریش هەرنـــەون
شەمـــــشەمە کـــوێرەی شـــــەون

جـــا وەك وانـــی ســـەر بـــە خـــۆڵ
هـــەرگیز دونیـــا مـــەگرە کـــۆڵ

لـــــەدور خۆشـــــە دەنگـــــی دۆڵ
ڕاســـــت نیـــــە بیرۆکـــــەی زۆڵ

گـــەر هـــات مردنـــی بـــەتین
لێـــت تـــاڵ دەکـــا دونیـــا و ژیـــن

هـــەر بـــۆ ئـــەو خوایـــە تاکـــە
پەرســـــتن بکـــــەی چـــــاکە

جگـــە لـــەو خوایـــە گـــەورە
وەکـــــو ســـــێبەری هـــــەورە

٢٠٠٥/٣/١٨

# جگـــەرە

ئـــەمرۆ جگـــەرە لـــەجیهان بـــاوە
لەمێـــژیش نیـــە سـەری هەڵـــداوە

بـــاوێکی بـــەدە بـــێ ســـوود و کەڵکـــە
ئەگەرچـــی ، هیـــوای دڵـــی زۆر خەڵکـــە

دوژمنـــی دۆســـتە بـــێ پـــەنا و پـــەردە
بـــە درێـــژی بـــاڵای ئـــازار و دەردە

بـــێ ژمـــار زۆرن زەرەر و زیـــانی
کـــەم خـــەڵکی هەیـــە هـــەمووی بزانـــی

بـــەڵام (کونیـــە)کـــەی لـــەلای دکتـــۆرە
هـــەر ئـــەو دەزانـــێ زیـــانی چـــەند زۆرە

تـــۆ ئـــەی ئـــەو کەســـەی جگـــەرە کێـــشی
نابـــێ لـــە قـــسەی ڕاســـت دڵـــی تـــۆ بێـــشی

چـــیتر مـــاڵی خـــۆت مـــەدە بـــە ســـووتان
بـــەزەیی بکـــە بـــە ڕەش و ڕوتـــان

خـــەڵکی وا هەیـــە هێنـــدە هـــەژارە
لـــە ماڵیـــی نیـــە یـــەك فلـــس پـــارە

جـا تـۆش بـۆ حـەز و ئـارەزوی کاڵـت
بەسـووتان مـەدە سـامان و ماڵـت

باشـیش بزانـە خـودا هـیچ تـاوێ
کـاری خەڵـکانی زێـدەڕۆی نـاوێ

ڕۆژێکـی ئـەوتۆت لەپێـشە کاکـە
حـاکمیش تـەنیا خواوەنـدی تاکـە

جـا بەسـە ماڵـت بـە ئـاگر و ( بـا) کـە
گـەر بیکـەی بـەخێر باشـتر و چـاکە

سـەیری کەسـێك کـە جگەرەکێـشە
دەزانیـت چـەندە دوو چـاری ئێـشە؟

ددانـی زەردن ، سمێڵـی بـۆزە
نـاو زاری تاڵـە ، لـووتی گـزۆزە

بـڕوای پـێ مەکـە کـە فێـت و فـۆزە
لەدەسـت جگـەرە کـاری ئـاڵۆزە

ئـیتر بـا بـەس بـێ ئـەم تامـە تاڵـە
بـا بـەس بـێ کۆخـە و بەڵغـەم و ناڵـە

٢٠٠٤/٨/١

# بەرخی نێر بۆ سەربڕینە

لەم رۆژگارە ؛ تەنکە ڕیشێ ئەگەر بۆ خوای گەورە بەردەم
سمێڵیشم کەمێ کورت بێ سیواکێکیش لەدەم وەردەم

پەنجەم لەبۆ ڕادکێشن دەستەی (ئەبو جەهلی) سەردەم
هەرچەند لەسەر ڕێی ڕاستیش بم، لای وان تاوانبار و جەردەم

کەچی منیش دڵ پاکێکم هاوڕێی گشت ڕاستی خوازانم
وەکو ئەوان درون پیس نیم , کاری سپڵەیی نازانم

دارێکم بە بەر و سێبەر لەچەقی ڕێی ڕێبوارانم
پیسانیش وەستاون دژی بەرهەم و دیمەنی جوانم

بەڵام ئەگەر بم هەنجنن بەگوللە یان بە مەکینە
تاکو هەڵم خەڵەتێنن ، پەشیمانم کەمن لەم دینە

ئەگەرچی زۆر هەوڵیش دەدەن دەستەی پڕ لەداخ و کینە
تاکو بچمە ڕێی هەڵەیان کە سەرئەنجام گریە و شینە

چونکە پڕ لە گورگ و وورچی کەڵبەتیزی زگ دڕینە
بەڵام بەموو لا ناکەوم لەم ڕێبازە ڕاستەقینە

ڕێبازێکی ڕاست و پاکە ڕێگای (رب العالمین)ە
هەرگیز دەست بەرداری نابم , بەرخی نێر بۆ سەر بڕینە

٢٠٠١/٢/١٠

# چوارینـــەکان

ئەی ئەوکەسەی کار بەدەستی خاوەن ڕێزو تاجو کورسی
گەر بزانی تا چ ڕادده لەژێر یاسا لێم بەرپرسی
بڕواناکەم وا بەتوندی بەدوای خۆتا ڕامبکێشی
وەکو لاشەی مردار بۆوە، لەبۆ بەردەم گورگی برسی
* * *

ئەی نەزانی لەڕاستی دوور هاوشێوەی قاڕونو هامان
لەپێناوی دەسەڵاتو ناوی دونیاو کەمێ سامان
لەو ڕۆژەی دەجالی کوێری درۆزن لەدایک دەبێ
ئەتۆو خەڵکی وەکو تۆنە دەبنە خزمەتکارو مامان
* * *

کەسێ ئەگەر مەبەستی بێ ڕێگای ژینت بشێوێنێ
نیازی وابێ بتخاتە چاڵ ، بۆ ئەوەی بونت نەمێنێ
ئەی براکەم ، ئەگەر ژیری نابێ هەرگیز لەلات وابێ
پێشەکی ، لەترسناکی ئەو چاڵە تێت بگەیێنێ
* * *

گەلێ خەڵکی بەرچاو هەنە بە ڕەواڵەت دەڵێن زێڕن
کەچی لەگەڵ گورك دەخۆن، لەگەڵ خاوەن شین دەگێڕن
ئەوان خۆیان لە ناو بەرگی موتمانەدا مەڵاس داوە
لەڕاستیدا ؛ لەگەڵ گورگان یەك دڕندە و توخم وبێژن
* * *

هەر ڕاستی ویست بە تا لەسەر خاکی
یەك ڕوو و یەك دڵ بە نەكەی ناپاكی
ناپاكی لە ناو گۆڕی تاریكدا
دەبێتە پەردە لە پێش ڕوناكی
* * *

مامۆستای من مامۆستای مامۆستایانە , پێغەمبەرە
وانەكانی ناگۆڕمەوە بە هەرچی زێڕ و گەوهەرە
هەر كەسێكی سەرفرازی لە هەردوو دونیادا دەوێ
با بگرێتە بەر ڕێبازی ئەم مامۆستایە ڕێبەرە
* * *

ئا لەم عێراقە كاول و وێرانە
گەلێ سەلكە گا لە مەنجەڵدانە
ئاگری دۆزەخی گەر لەبن هەڵبێ
تا دەكوڵێ دەمرین لە دیار ئەو نانە
ئەگەر پێش بگا هیچ تامی نابێ
هەتاكو كوفری پۆخەڵ كابانە
* * *

خەڵكی نەشیاو و پێخواس و برسی
گەر دەستی ئالا لە یاسا و كورسی
خەڵكی لەگەڵ خۆی دەبا و دەخاتە
ناو گێژەڵۆكەی پڕ لە مەترسی
* * *

بــــە نەســــتەم . بــــەئازار و نـــێش

شــــان بەشــــانی ئــــەو چــــومە پــێش

وام زانـــــــی هـــــــەنگی هەنگوینـــــــە

بـــــەڵام داخەكــــەم بـــوو بـــــە مــێش

*　*　*

گیانە تاكو ماوەت ماوە، دەستو بازووت لەخێر هەڵكە

دونیا كێلگەكی پاراوە ، بڕوێنە كام تـۆو بـە كەڵكە

مـردن خرپـەی لـەناكاوە ، كۆتـایی دێنـێ بـە ژینـت

ئەو كات ئەوەی جێی دەهێڵێ ، بەتێكڕایی لەبۆ خەڵكە

٢٠٠٤/٣/٨

بازەكـــانی كۆهـــساردكان ئـــەمڕۆ دیلـــی قـــەل و (بــۆ) ئــە!!!

لــە ئاسمانـــان ئازییـــان دەكـــرد , ئـــاخۆ ئێـــستا حاڵیـــان چـــۆنە؟

بەڵام ئەی باز هەر بەردەبییت لەدەست قەل و ئەو چاومۆنە

زۆر بـــێ ووره و ترســـنۆكن تۆقیـــوی ســـێبەری تۆنـــە

٢٠٠٣/١٢/٨

*　*　*

هــۆ هــەنگی پــێ بەهەڵالــە گــەر بتــەوێ ســەرت نێــشێ

بەهیچ جۆرێ نەكەی بكەی دەست لـەملانێ لەگەڵ مێشێ

ئەگەر شوێن پێی مێشت هەلگرت ناخۆشیت دێنێتە پێشێ

لــە گوڵاڵــەكان ئــەتتۆرێنێ بــۆ ســەر چڵكاو ڕات ئەكێشێ

٢٠٠٣/١٢/٢٥

دنیـا وەکـو مـامز وایـە بۆچـی هێنـدە بـەدوای وێڵـی
کـە دڵنیـای پێـت نـاگیرێ , بـۆ فریـو دەخـۆی بـەفێڵێ ؟
بزانـە سـەر ئەنجامەکـەی دەچـیتە گـۆڕی تەنگـەوە
ئـەگەر هـەزار سـاڵیش بژیـت ڕۆژێك دادێ بەجێی دێڵی
* * *

هەستە سەرپێ دەبا بەس بێ ، بێ دەنگی و ژین پەرستی
دەست بەکڵاوی خۆت وە مەگرە ، شـەرمە مەنوێنـە سستی
مـەردێکی راستەقینە بـە ڕوو بکـە ئاسـۆی سەربەسـتی
یەك ڕۆژ سەربەستی باشترە لەسەدان ساڵی ژێـر دەسـتی
* * * ٢٠٠٣/٦/١٨

ئەی کەر ئەگەر ناوێریە کەر بۆ هێنـد داخـت لەکورتانـە؟
خـۆ کورتـان هـیچ خـەتای نیـە پـوش و پـەڕۆی بـێ تاوانـە
بۆ گەز و لووچکەی لێ دەدەی ، ئەی داری دەستی بێگانـە
خـۆت لەکـەران کـەرتر مەکـە ، ماڵ و ملکی هەردووکتانـە
* * *

بازی بەرزە فڕ لە بەرزی بەدەنگ بەرزی ووتی : ئەی قـەل
چـیتر مەچـۆ سـەر زبـڵدان هـەتاکو کـەی نابیـت بەمـەل
لـە نـاو مـەلان وەکـو مـەلان مەلـەوانی لـەئاسمان کـە
ئـەی بـێ ئـابڕو بـۆ ناترسێی لـە نـەفرینی چاکترین گـەل

٢٠٠٤/١١/١٥

* * *

ئەی براکەم چاك بزانە ئەگەر ببیە میر و سەرۆك
سەرانسەری دونیا بکەی وەك مانگ و ئەستێردی گەڕۆك
هەر دەبیتە دیلی مردن بە زۆر بێ یاخود بەخۆشی
دەبێ وەکو باپیرانت ، تامە تاڵەکەی بنۆشی

٢٠٠٤/٤/١

* * *

موسڵمانان دەست بەرز کەن بۆ خواوەندی بەرز و بەڕێز
هەتاکو کەی لەپێناوی نابنە یەك دەست و دڵ و هێز؟
سەرکەوتن و سەرفرازی لە یەك لا بوونەوە دایە
چیتر مەلۆتکەی دەجالان مەگرنە باوەش و ئامێز

* * *

ئەی خواوەندی گەورەی جیهان ، تۆی پیرۆز دەسەڵات زاڵی
ئەم ڕۆژگارە بۆ خواناسان بکەیتە مایەی خۆشحاڵی
بازیش وەکو ڕۆژانی خۆی بێنێتەوە پەڕ و باڵی
تاکو چیدی قەل ڕوو ڕەش ، پێی نەنۆشێ تفت و تاڵی

٢٠٠٥/١/١٥

* * *

خەلکی زەوی و ئاسمانەکان کەس نازانێ زۆریان چەندە
ئەگەر کۆك بن لەسەر یەك دڵ ، چەندن هەزار جار ئەودندە

هــەموو بــبن بــە خراپــەکار، یــان بــە بــڕوادار و بەنــدە
هــەرگیز کــەم و زیــادە ناکــا لەخوایــەتی ئــەو خواوەنــدە

٢٠٠٤/٤/٢٠

بـۆچـی تـاوان ئـەنجام دەدەی دە واز بـێـنە ئـەگــەر مــەردی
ئـەنجام دەدەی نــارەوایــی تـۆ نـەمر نیت لـەسەر عـەردی
دە واز بـێـنـە تـۆ نـەمر نـیت دەچیە وە لای خـوا وە نـدی تاك
ئەگەر مەردی لـەسەر عـەردی خـواوەنـدی تـاك بـبـە كـار چـاك

*  *  *

وای کــــردوە یاسای ڕۆژگـار تەنگ هەڵچنێ قەل بە بازی
یاسـای ڕۆژگـار نـا ئـاسـا یـە هەڵە بە ڕاست دەکــا وازی
تەنگ هەڵچنێ هەڵە بە ڕاست پێی شاد دەبێ گـونـدە بـەبـۆ
قەل بـە بازی دەکـــا وازی گـونـدە بـەبـۆ پـێی دەنازی

تێبینی : ئەم دووچوارینەی سەرەوە بە ستوونی و بە ئاسۆیی دەخوێندرێنەوە

نـە ڕۆژهـەلات ، نـە ڕۆژئـاوا ، تەنها ئیسلام ڕێـی گـونـجـاوە
جگە لە ڕێی ئەم ئیسلامە هەمووی کۆسپ و کەند و داوە

*  *  *

ئـەوەی بـۆ خـوا نـەبێ یـاران سـوودی نیـە بـێ بەهایـە
ئەگەر زەوی و ئاسمان پڕ کا سـەنگی وەك بـاڵی مـێش وایـە
ئـەی خەڵکینـە گـەر بـەهیوان قـازانج ئـەخوا سـەری مایـە
ئـەوەی دەکـەن ، بیکـەن لـەڕێی زاتـی پـاکی ئـەو خودایـە

٢٠٠٤/٥/١٤

تـاکو خـوێنی نـاڵ و سـوورت لەجەسـتەیا دێ و دەچـۆڕێ
بۆ دوژمنی ڕق ئەستوورت چۆك دانەدەی بەهیچ جۆرێ
مـل کـەچ کـردن ، بـاش بزانـە ، کـارێکی نـامەردانـەیە
خـواش بـە چاوی میهرەبانی بـۆ بـێ غیرەتـان نـانۆڕێ

٢٠٠٢/١٢/١٩

* * *

گـەر جنۆکـەو ئـادەمیزاد ببنـە یـەك دەسـتە و هێـز هـەموو
کۆببنــەوە لەیــەك بـەرە دژ بەخواوەنـدی ، هــەر هـەبوو
هێزو بازووی یەك یەکەیان هێنـدەی سەرجەم ئەوخەڵکە بێ
ملیـان لەئاسـتی هێـزی خـوا زۆر زۆر باریـك تـرە لـە مـوو

٢٠٠٤/٢/٧ * * *

دە هـەنگاوێ ئـەی بـەجێ مـاو بـۆ گـیرۆدەی خـەیاڵاتی ؟
وا تەمــەنی لاویــت ڕۆیــی ئــەی میــوانی دونیــای کــاتی
دەرگــەوانی قــەڵای خــەوی ، دۆســتی دوژمنــی خــوداتی
بۆیـە کەساسـی ؛ نـازانی بـۆ کـوێ دەچی و لـەکوێ هـاتی

٢٠٠٢/٧/١٩ * * *

گـەر بـارانی پەڵـەی لێـدات پـەڕە و گـەڵای گوڵـت پووتـە
جڵـەوی لـە خـوا ترسـانت چـونکە لـە دەسـت ئارەزووتـە
ئـارەزووە سەرشێتەکەشـت هەڵـگری شوێن پێـی ( طـاغوت)ە
بۆیـە نـەنگی تـۆ و گوڵەکـەت بـە ئاشـکرا دیـار و ڕووتـە

٢٠٠٠/١٢/١

زۆر لەمێـژە چـاوەڕێ بـووم شـەو نـەمێنێ , خـۆر هـەلێ
عــەردی تینــو پــاراو ببــێ بــەئاوی پــاکی پــەلێ
کــە پــەلێ دا خــۆریش هــەلات تــاریکی ووتــی: بــەلێ
چـونکە شـەو مـەرگی نزیـك بـوو وەسـیەتی مـردن دەلێ
٢٠٠٠/٩/١٤ * * *

ئـەی ئـادەمی ئەگـەر خـۆت و خـوا دەناسـی نابـێ هـەرگیز
خۆت بەگەورە و خەلکیش بەکەم سەیر بکەی بە لەنجە و فیـز
هەر فیز بوو وای هێنایە سەر شەیتانی دەرکراو و زیـز
چۆن بەفیز لووت بەرزنەکەی، ئەی کوڕی دووجار ڕێگای میـز
٢٠٠٤/٤/٤ * * *

با دوژمنـان باش بم ناسن ڕاستی ویستێکی خـوا ناسـم
دژ بـە غەرقـەد کـە نـەمامی باوەڕیانـە کلکـی داســم
لــە مــردنیش بـاکم نیــە هــەزار گیـانم هــەبێ
بــەختی دەکــەم لــە پێنــاوی ڕێبازەکــەی بـاوکی قاســم

* * *

هەنــدێ کـەس هــەن ، واتــێ دەگــەن ، خۆیــان و هاوبیریـان مــەردن
لــەپێش لــووتی بتــی زینــدوون ، وا دەزانــن بــت هــەر بــەردن
ســـەری ڕێـــز و تەمبـــەلیان بـــەدل لـــە بـــۆ دەچـــەمێنن
بــێ گومــان ئــەو ســەر گێژانــە گــیرۆدەی پــیس تــرین دەردن
٢٠٠٠/٩/١١

کـــەســـی ســك تـــێـــر ، چـــاو بـــرســـی
نـــــاشـــێ لـــــە بـــــۆ بـــەرپـــرســـی
لـــــەو ڕۆژەی دەســـــــتـــی ڕەشـــی
دەگـــــاتـــــە تـــــەخت و کـــورســـی
ژیـــــانی خــــــەڵـــکـــی بـــە تـــێـــکرا
دەکــــــەوێـــــــتـــــە مــــــەتـــرســـی
٢٠٠٤/١/١٥

* * *

هەرچەند لە ناو گۆڕیشا بم ئەی براکەی هاو سەنگەرم
وا تـێـنـەگـەی مـردوێـکـی فـەرامـۆش و مـات و کەڕم
لە هەر کاتێك بانگم بکەی لە ڕێی خودا و نـیشـتـیمانم
وەکـو شـێری نـاو بێشـەلان بـە خـێـرایی ڕا دەپـەڕم
٢٠٠٣/١٠/٩

* * *

ئەی خەڵکینە بەر لە ئێستا منیش یەکێك بووم وەك ئێوە
بـەڵام خـەڵات لـەخـواوە هـات ووتـی بـەسە مـەجوڵێوە
لەو ڕۆژەوە هـەموو تـوانـام بـخـەمە گـەڕ بـەگشت شێوە
هـێـزی مـنداڵێکم نـابـێ وەکـو ئـەو بـڕۆم بـەڕێـوە

* ئەم چواینەیە لەسەر ژیانی خۆمە

# گۆڕ یەکەم بازگەیە

ئـــای چـــەندە ســـەختو دژواری مـــــردن
ئـــەو خەڵکـــە زۆردت هـــەموو ون کـــردن
هەنـــدێك بەنـــەرمی هەنـــدێکیش بـــەزۆر
خۆزگـــە دەمزانـــی لـــەبۆ کوێـــت بـــردن؟!!

گـــشت کەســـێك گـــۆڕی لـــەرێ و لەپێـــشە
یەکـــــەم بازگەیـــــە پـــــڕە لەکێـــــشە
وا باشـــە تێـــشووی چـــاکی بـــۆ دانـــێین
تـــا لێـــی ڕزگـــار بـــین بـــە بـــێ ســـەر ێـــشە

تەوبـــــە دەرمـــــانی تـــــاوانو ژەنگـــــە
هـــــەتا زوو بیکـــــەین هێـــشتا درەنگـــــە
گیـــانی شـــیرینمان جیـــا دەبێتـــــەوە
لـــوول دەکرێنـــە نـــاو ئـــەو شـــوێنە تەنگـــە

هـــەر کەســـێ ئەگـــەر ژیـــرو هۆشمەنـــدە
مـــردن لـــەبۆ ئـــەو باشـــترین پەنـــدە
ئەگـــــەر دەزانـــــی چـــــەندە بەســـــامە
قـــەد پـــێ ناکـــەنیو ئـــاگری خەنـــدە

بـــچنه گۆڕســـــتان کـــــەمێك دامێـــــنن
بەچـــاوی دڵتــــان تێیـــــان ڕامێـــــنن
ئەوانـــەش هــــەموو وەکـــو ئێـــوه بـــوون
ئەگەرچـــی ئـــــەمڕۆ بـــێ ســـەرو شـــوێنن

کــــەوابوو بۆچــــی مەســــتو ســــەرقاڵن
شــــوێن کەوتـــەی دونیـــاو ئـــارەزوو مـــاڵن
بێگومــــــان ڕۆژێ وەکـــــــو ئەوانــــــــه
دەبـــێ لــــەو شــوێنه بـــۆ خـــۆ بنـــاڵن

٢٠٠٤/٦/٢٨

# کــفــی بالموت واعـِظـــا

# کوێره ڕێگا

چاك بزانه ئەی موسڵمان جگه لەڕێبازەکەی تۆ
هەموو هەڵەن بێ بەرهەمن
گێژو کاسن*
بێگومانبه هەموو ڕێچکەو ڕێو ڕێبازی نائیسلامی
کۆتایەکەی لانەی وورچه
گەر بەهەوای هەڵت واسن*
دڵنیاش به ئەو کەسانەی کەوا لەسەر ڕێگای هەڵەن
بۆ بڕینی ڕەزوو باغی هەموو دونیا
کلکی داسن*
بەڵام ئەوان ڕەگیان سسته هەرچەندەکی بەناخ خۆڵا
چوونەته خوار وەك دیواری سەر بەفر وان
خوانەناسن*
با ئەوان هەر زۆر بەهێز بن، بەتوانا بن، بابورکان بن
با هەر ببنه تاریکیو ژەنگ، بەخراپی
شایستەی باسن*
بەمستێ ئاو سارد دەبنەوە ئەگەر ببنه هێزو تینی
گڕو گڵپەی ئاگرو ئاسن*
ڕێبوارانی ڕێگای هەڵەو کوێره ڕێگا شایسته نین
وەکو شێته شەو گەڕەکان
هەر پێ خواسن*
لەژێر باری هەناسەی سارد هەڵدەکێشن
فامیان کاڵه بێ شەرمی مەستو کەساسن*
ئەگەرچی زۆر باش دەزانن هەزار دەرزی نابێته
پارسەنەگی گاسن*  ٢٠٠٢/٦/١٩

# بۆ منـــاڵان

ئـەی منــــداڵ ئارامی گیان     گــەر لـەخـەو هەڵسای بەیان
دەست و دەم و لـووتو چاو     دەبـێ جـوان بـشـۆی بە ئـاو
بە بێ دەنگـــیو بە جوانی     بـڕۆ ڕۆخ سـفـرەی نـانـی
زۆر بـە جوانـی دانیشــــە     بێدەنگیش بە هـەمـیـشە
گـەر خـواردت نـان و چایـە     بڵـێ : سـوپـاس خـودایـە
دەست خۆشیش کە لە دایـە     ڕەوشـــت پـاکـــزی وایـە
جـا دەست دە ئـەو وانانـــە     کە دەیـــخـوێـنی ڕۆژانـە
بـە ئەم ڕەوشـتـە جوانـــە     بـچـۆ بـۆ قـوتـابـخـانـە
کـاتێ کە چووی بەڕێـــوە     بەجـوانـی بـجـوڵـێـــوە
مـــنداڵی جوان و بێگــــەرد     شـەق مـەدە لە قوتیو بــەرد
گــــۆرانی وتن بـە دەنـــگ     ئەمـەش نـابێ بە هـیـچ ڕەنگ
لـەگـەڵ خـەڵکی بێگانــــە     لـــە دەرێ و قـــوتـــابـخـانـە
یەکتریتان خـۆش بـــوێ     بـبـن بـە ئـەوەی نـــوێ
لـە گـەڵـیان ببە بەبــــرا     پـەروانـەی عـەشـقـــی چرا
ئـــەوەی مـــامـۆســــتا دەڵێ     ئـەتـۆش پـێـی بڵێ : بـەڵـێ
ئەی منداڵی ژیـر و پـــاك     بە ڕەوشـتـی جـوان و چـــاك
کـە تـۆ چـوویـتــە دەرەوە     هـەر بـەو شـێـــودش وەرەوە
وا بـاشـتـرە ئـــەی جوانـــە     کـــاتێ لـە قـــوتـابـخـانە
گـەڕایـەوە لە بـــۆ مــــاڵ     بـــە وانـەت ببی ســـەر قاڵ

لەوەش نابینی کەڵك   لەگەڵ منداڵی خەڵك
بکەی ئاژاوە و کێشە   بۆ دایك و باوکت ئێشە
کۆتا ووتەم بەهەر حاڵ   بۆ تۆی ئازیزم منداڵ
خاوەن هەست و هۆش و ژیر   ڕێز بگرە لە خەڵکی پیر
گەر تۆش بووی پیر و بێ هێز   با خەڵکان لێت بگرن ڕێز
هەروەها لە تۆی نەبەرد   ئیسلامی پاك و بێ گەرد
نەوەی هیوا و داخوازە   ببی بە نەوەی تازە

٢٠٠٢/١١/١٨

# لَيس مِنّا مَن لم يَرحَم صَغيرنا ويُوَقِّر كَبيرنا

# بێ هیوا

بۆدانیشتووی دەستەو نەژنۆ بێ هەستو نەست هێند لەمێژە؟
هەڵسە دڕکی نەگریس دەرکە لەشوێنیاندا گوڵ بنێژە
چونکە دڕك جێی نازارە گوڵیش دەستی بەدەست نوێژە
بەرهەمی ئەم کارەش دەخۆیت، مەڵێ هیوای دوور و درێژە
ئەگەرچی، لەدوای بڕینی، زۆر هەورازو کەندو لێژە
ئەم ڕاستیەش باوێردی سەر زمانت بێ هەر ببێژە
جگە لەم ئیسلامە پاکە، هەمووی هەڵەو کاسو گێژە
هەویری هەزاران دەستی چڵکنو پیسو بەقڕێژە

٢٠٠٤/٢/١٠

وَ رَضیتُ لَکم الإسلامَ دینا

# بولبول و قەل

ڕۆژێ لەسەر زبڵدانێك قەلی بێ ووره و چەنەباز
بەشانازی‌و پاشە ملە سووکایەتی دەکرد بەباز

زۆر باڵندەی ناماقوڵیش ئا لەو کاتی لەلای قەل بوون
باڵیان لەسەر سینگ دانابوو ئەوانیش هەر بەناو مەل بوون

قەلی لەرزۆك دەیوت بەوان: باز باڵندەی زمان لووسە
بێ گومان بن لەبەردەمم چۆك دادانی چارە نووسە

هەرچی هاتە سەرزاری قەل درۆزنانە بۆیان دەڵێ
بەزمانی بێ ویژدانانە ئەوانیش دەیان ووت بەڵێ

بوولبولیش لەسەر چڵێکا بەدەنگێکی شیرین‌و خۆش
هاتە وەڵام ووتی ئەی قەل شەرمە بۆ تۆی بێ فام‌و هۆش

زمانی لووست خستۆتە کار دژ بەگەورەی هەموو گەوران
ئەگەرچی، وا سەردەمێکە تێکەڵ نەبووە لەگەڵ هەوران

بۆ کاتی خۆی لەئاسمانان بازی بەرز ئەخولایەوە
ئەوەی قەل بوو لەبەرسامی وەکو سەهۆڵ ئەتوایەوە

بەبێ ڕاڕاو گومانیش بە، یەك ڕۆژ مابێ خۆر بێتەوە
جڵەوی یاساو دەسەڵات وەك لەمەوبەر دەگرێتەوە

جا هیچ باسی بازی نەکەی شێواوێکی گەلێ سەیری
بازی ئازا شایەنیەتی ئەتۆی پیسیش بەناو تەیری

خۆت لەگەڵ وی بەراوردکە خاوەن بوونێکی لاوازی
ئەو لەهەوران سەردەکەوێ تۆش سەرقاڵی چەنەبازی

شوێن و ڕێگاو جێگاکەی تۆش زلکاوو سەر زبڵدانە
ناپاکی و قسەی بێ هودە گەلێ زۆرت لەدڵ دانە

بەو جۆرە زمانت مەگێڕە ئاخاوتنت گەلێ سەیرە
خۆر هەر دەردێت لەبن هەوران باز سەرداری ئێمەی تەیرە

تاکو یاسالەدەست باز بوو بۆ دیار نەبووی لەهیچ شوێنێ؟
بازی ئازا لەبۆ قەلی هەموو دونیا سەر نانوێنێ

ئەمڕۆش چاوی لێت وون بووە بۆیە وا غەرقەد ئەڕوێنی
دڵنیاشی هەر دێتەوە لەڕەگەوە دەریدێنێ

کاتێ بولبول ئەمانەی ووت قەلی ڕوو ڕەش زۆری پێشا
لەناخیەوە بۆ داهاتووی ئاهی قوڵی هەڵدەکێشا

٢٠٠٢/١١/٢٠

# نەکـــەی !

دۆستو یاری ئەوها هەیە دەیان دوێنی بەبرا و کاکە
لەناخت جێی کردۆتـەوە، موتمانـە پـێ کـراوی چاکە

لـەکاتی خۆشـیت دا خۆشــە لەناخۆشــیدا خەمناکـە
کەچـی دژ بـەتۆ خــەریکی بـیری فــوڵی ترســناکە

هەتا یەکێ وا یـارت بـێ دەسـتت لـەملی مـەرگ دایـە
جا تێکەڵی کەسانی وا بـەهیچ جۆرێ نەکەی چاکە

٢٠٠٤/٨/٣٠

## ياوَيلَتا لَيتني لَـم أتـَّخِذ فُلاناً خَليلا

# دوژمنایەتی سەگ و پشیلە

لـــــەزدمانی زوو ســـــەگو پــــــشیلە
هاوڕێی یـەکتر بـوون بـێ فـێڵو (حیلـە)

ســـوێندیان بەســـەری یـــەکتری ئـــەخوارد
وەك دوو بـــرا بـــوون خۆشـــیان ڕائـــەبوارد

ڕۆژێ بـــاپیرە گـــەورەی هـــەردووکیان
لـــەبۆ ڕاوکـــردن چـــوونە دارســـتان

پارچە گۆشتێکیان دەست کـەوت بـەو جـۆرە
ئینجـــا هـــەڵیان گـــرت نـــۆرە بـــەنۆرە

ئـــەو دوو بـــرادەری گیـــانی بـــەگیانی
بەقـــــــسەکردنو لاوكو گـــــــۆرانی

هـــەر باســـی گۆشـــتیان دەکـــرد لـــەڕێگا
بـــۆ پـــشوو دەوەســـتان لەهەنـــدێ جێگـــا

ئینجـــا پـــشیلە هاتـــە دوان لـــەوکات
گـوتی: ئـەی هـاوڕێ نـۆرەی مـن داهـات

مـــن هـــەڵی دەگـــرم بـــۆم جـــدە بـــەگۆڵ
ســـەگەکەش پێیـــدا هـــەر لـــەبنی دۆڵ

کاتـــێ پـــشیلە داینــا سەرشـــانی
بەســـەگەکەی ووت جـــا بـــەگۆرانی

تـامی ئـەو گۆشـتە هـیـچ کـەس نایـچێژێ
تـــاوەکو خـــوێنی ســـوورم نەرێـــژێ

ڕەنـــجو خـــەباتم ئەمـــەی بەرهەمـــە
ئەگەرچی بـەهای سـی چـوار دەرهەمـە

ســـەگەکە وتـــی پـــشیلە بوەســـتە
هـەرگیز گـوێ نـاگرم لـەو لاوكو بەسـتە

ئـــەوەی تـــۆ دەیڵێـــی زۆر نارەوایـــە
پلانـــی خراپـــت لـــەبن ســـەردایە

لەســـەر کـەمێك گۆشـت کـاری وا شـەرمە
بەشـــی زۆریـــشی ئێـــسكو چـــەرمە

شـــتی وا نەکـــەی چـــونکە خەتایـــە
لێـــت تـــوورە دەبم هـــەتا هەتایـــە

پـــشیلە بـــۆ گۆشـــت زۆر تامـــەزرۆ بـــوو
هاوڕێیـــەتی خـــۆی دەرخـــست کـــەدرۆ بـــوو

گۆشـــتەی بـــردو چـــووە ســـەر دارێ
ســـەگ زۆر هـــەوڵی دا نەهاتـــە خـــوارێ

گۆشتەکەی هەمووی خوارد لەبەرچاوی
سەگیش لەبن دار زۆر بەداماوی

لەسەر دەستان کەوت دەی ووت بەپشیلە
ئەگەر دەم زانی دەکەی ئەو حیلە

ئەو کۆڵە گۆشتەم نەدەدا دەستت
بەڵام ئەم زانی پیسە مەبەستت

ئیتر لەو ڕۆژی، ئەو بەش خوراوە
ئەو ترس و سامەی بەپشیلە داوە

خەڵکیش ئەو قسەی هێنایەکایە
پشیلە چاوی بەسەگ هەڵنایە

بۆیە گەر سەگی بینی لەشوێنێ
پشیلە هەڵدێ، لەوێ نامێنێ

جا هەرگیز نەکەن کاری ناپاکی
چونکەکەس سەیری ناکا بەچاکی

کەچی پشیلە ئەو کارە بەدە
کردی لەپێناو ئارەزووی گەدە

٢٠٠٣/٢/١٠

# خۆشەویستی پێغەمبەر

گـەلێك گـەرمو بەبلێـسەیە ئـەو ئـاگردی بـەر بۆتـە دڵـم
بـەهیچ جـۆری دانامرکـێ بەعەشـقی تۆیـە ئـەی گـوڵم

دیـــدەکانم پـــڕ لەئەشـــکن ناخیـــشم بۆتـــە خۆڵـــەمێش
دەروازەیـــان بـــۆت والآیـــە دەرمـــانی (زامـــی دڵ)و ئـــێش

دڵـــم هـــەر دەکڕوزێتـــەوە هـــۆ ڕونـــاکی پـــڕ ســـەبووری
ڕێگای چوارده سەدەو نیوان ئەگەرچی تـۆش لـەمن دووری

هـــۆش‌و بـــیرو خـــەیالآتم بـــەلاّم هـــەر دێـــن بەدواتـــەوە
شـتێ نیـــە لـەم گەردوونـە عەشـقی تـۆم لـەبیر باتـــەوە

بـــەهۆی تـــیری خۆشەویـــستیت حـــەوزی ئـــاوی چـــاوەکانم
دڵـــۆپێکی تـــێ نـــەماوە گـــوڵی هیـــوای حـــەزی ژیـــانم

تـــۆ بیلبیلـــەی چـــاوانمی ئـــەی ئـــاودێری هـــۆش‌و هەســـتم
تـــاجی شـــکۆو دادپـــەروەری هێـــزی ئـــەژنۆو دڵ‌و دەســـتم

بەهۆی گڕی عەشقت، ئەشکم بـەخوڕ لـە چاو دێـن و مەستم
بـەخۆڕایی نیـە ئـەڕژێن ئـەی لوتکـەی بـەرزی مەبەسـتم

خۆشەویـــستیت وای کـــردووە کـــەوا بـــبم بەدێوانـــە
یـــادی پـــڕ لـــە میهرەبانیـــت چارەســـەری گـــشت دڵانـــە

شـــەوە زەنـــگ و ڕێگـــای هەڵـــە بـــۆ منـــت ڕوون کردۆتـــەوە
بۆیـــەمنیش بـــۆ ســـاتێکیش ئـــەتۆم لـــەیاد نەچـــۆتەوە

بـــەڵێن وابـــێ تـــا بمێـــنم ئـــەو ڕێبـــازە پاکـــەت ڕێـــم بـــێ
بەقەد مووێك لێی لانادەم ئەگەر کونجی زینـدان جێم بـێ

یـــەکێکی وەك تـــۆ (موحەمـــەد) پێـــشەواو پێغەمبـــەرم بـــێ
دەبـــێ ســـۆزم وەکـــو گـــڕی گڕکانـــەکان بـــۆیی گـــەرم بـــێ

٢٠٠٣/١/١

# أللهم أرزقني حبك وحب من أحبك

# بێ باکـــم

گەر بەچاکی پەیڕەو بکەم فەرمانی خواو پێغەمبەری
دەبـــێ بـــەکۆڵ دادەم کـــوڵی ئـــاوارەیی‌و دەربـــەدەری

چوونکە تـاریکی خوازەکـان زۆر بـێ هۆشـانەو سەرسـەری
دژی ڕاســـتی ڕاوەســـتاون، ڕقیانـــە لەدادپـــەروەری

بـەڵام ئەگـەر لافـاو بکـا، کـوفری پـڕ لـەداخ‌و کینـە
بـەنووکی ڕم جـەرگ‌و دڵـم دەربهێنـی لـەناو سـینە

دەســـت‌و بـازوم نابـێ شـل بـێ لـەپێناوی ئـەم ئاینـە
شـــانازیە ئەگـــەر ببمـــە شـــەهیدێکی ڕاســـتەقینە

ئەگـەر ببنـە درك‌و بەربەسـت بـۆ لـەبار بردنـی دیـنم
دەســـتی ڕەشـــی فێـــرە تـــاوان بگێـــڕن لـــەناو بـــرینم

ئەسـتەمە پێیـان لـەنگ ببـی ڕێبـازی تـازەو دێـرینم
چونکە من زۆر پێخۆش حاڵم لـەڕێی خـوا مـەرگم ببیـنم

٢٠٠٢/١٢/١٩

# خوایە گیان

مەگە لەتۆی لێبوردە و تاك كەس پێ نازانم ناناسم
خۆم بەدەرگای لێبوردنت بە داماوی هەڵدواسم
ئەی خوایەگیان بە بەزەی و گەوردیی خۆت ئازادم كە
لە مەحشەریش بمخەرە بەر شەفاعەتی باوكی قاسم

خوایەگیان ئەی كردی گارم
بەندیەكی تاوان بارم
بەو هیوایەم تۆی میهردبان
ڕووناك بكەی گۆڕی تارم

خوایە باڵی بەزەیی خۆت گەر نەكێشی لە بۆ سەرم
تەنها ساتێ پێم ناگیرێ بەرگەی ئاگری ڕەش و گەرم
بە ئومێد و هیوا خوازم بە بەزەیی خۆت بمبووری
چونكە لەسەر ڕێبازەكەی تۆی بەهێز و پێغەمبەرم

ئەی خوایە گیان منی بەندە
بەردەمم پڕ كۆسپ و كەندە
ئەوەی لە ڕێگای تۆ لادات
سەرگەردان و زدردرمەندە

لەئاست هێز و دەسەڵاتت کزۆڵەکێ زۆر لاوازم
لەبۆ زۆری تاوانانم بەخشندەیی تۆ دەخوازم
گەر ببوری لەمنی هەژار ئەی خوایە گیان چیم دەربەستە
کۆسپ و هەڵدێر هەرچەندەکی بێنە ڕێگام سەرفرازم

خوایەکی بێ وێنە و تاکی
دەت پەرستم زۆر بەچاکی
هەرگیز وەکو شەمشەمە کوێر
خۆم پەست ناکەم بە ڕووناکی

جا هەتاکەی فەرامۆش بێ هۆش و ژیری کاڵ و مەستم
دونیا کێڵگەی ڕاست و پانە لە بۆ دوارۆژ لەبەردەستم
بەبارانی بەزەیی خوا پەڵەی داوە پڕ لەهاتە
گەر ساویلکە و نەفام نەبم تۆی ئەڕوێنم بۆ مەبەستم

٢٠٠٢/١٢/١٠

ما يَفعَلُ اللهُ بِعَذابِكُم إن شَكَرتُم وآمَنتُم

# چار نییە

گەر هەزار ساڵان بەپاڕانەوە
بپاڕێنەوە لەبۆ مانەوە
دەبێ بەناچار دونیا جێ بێڵن
جا توێشوو دانێن بۆ هەستانەوە

لەڕۆژی دوایی خوای بەدی هێنەر
زۆر بەناسانی دەوهێنێتە دەر
ئەگەر حەز بکەن لەدڵ ئارامی
ببنە ڕێبواری ڕێگای پێغەمبەر

هەموو کەس دەمرێ بەبێ جیاوازی
وا باشە هیچ کەس بەخۆی نەنازی
گەر عومری نوحتان هەبێ بێ سوودە
کە وابوو ، بۆچی خوا ناکەن ڕازی؟!

جگە لەزاتی ئەو میهرەبانە
مردن ئەرکێکە لەسەر هەموانە
هەموو کەس دەبێ تامی بنۆشێ
گەرچی دەردێکی سەخت و گرانە

٢٠٠٢/١/٥

# موناجات

زۆر گەڕام و سوڕامەوە  بە ویستی نەفسی سەر کەشم
ڕووم کردە هەرلا و لایەنێك ,خەجاڵتی ددبووە بەشم

چونکە دڵم مەیلی دونیا  و  ئارەزووەکانی  دەخوازی
کاتێ بوونە ناسیاوی یەك  دەستیان کرد بە گاڵتەبازی

کەچی دونیا وەك پاڵەوان یەخەی دڵمی گرت بە مەستی
دڵم کەوتە نوزانەوە , کاتێ  زانی  پێی  ناوەستی

بەڵام سوپاس بۆ خوای گەورە , بەزدیی کرد پێی نەدۆڕا
ئەویش بەخۆی دا چووەوە , بەرەو ڕێگای ڕاستی گۆڕا

ئینجا لە خوا پاڕایەوە , دڵەی هەژارم  بەم  ووتە
ووتی : جگە لە زاتی تۆ هەمووی سەر شێواو و بتە

ئێستاش  ڕووم لە ڕێگای تۆیە , چەند ساتێکە تۆم ناسیوە
خۆم  بە دەرگای لێبووردنت , بۆ لێبووردن  هەڵواسیوە

تۆ شایەنی پەرستنی میهرەبانێکی  شاکاری
پەنا و هێزی بێ هێزانی باشترین پاڵپشت و یاری

بـۆ پـەرسـتـن مـنـت داوە ڕێـگـات دەگـرم بە ڕێواری
لە بەر خەشمی تۆ ناوێرم هەنگاوێك بـنـێم بـە خـــواری

ڕوو لە دەرگای هەرکەسێ کەم و پەشیمانی و ژان و ئێشـە
خۆم خستۆتە بەر دەرگای تۆ ئازادم کە بەبێ کێشـە

ئـەگـەر ئـاوت هـەتـا مـردن ببێتـە ویردی سـەر زارم
چاکەت زۆرە بە سەرمەوە , خـوایە گـیان هـەر منەتبارم

نێـوان ئـەرز و ئـاسـمان پڕکەم لە حەمد و سوپاس گوزاری
ناکا نرخی نیو چاکەی تۆ , جا بمبوورە خودای (باری)

لە کـۆتـایی هـیوادارم بـەچـاکـەی خـۆت بـمـان پۆشی
گۆڕی تاریك و تـەنگمان پڕ بکـەی لـە خـێر و خۆشی
٢٠٠٥/٨/٢٥

أَنا عِندَ ظَن عَبدي بِــي

# دەردی من

بەرزی و بێ گەردی بۆ خوای بێ وێنە
هەموو دانانی ڕاست و لە جێنە
هەر کارێک ئەگەر خواوەند پێی باشبێ
ئێمەش پێی ڕازین دەبێ هەر واشبێ
کەسێکیش ڕەخنەی لەکاری خوابێ
خەجاڵەت باری هەردوو دونیابێ
خەڵکانێک هەنە خودای کار تەواو
دەست و پێی بەستوون بەبێ کۆت و داو
منیش یەکێکم ئا لەو کەسانە
ئەمرکێکی قورسم وا لە سەرشانە
لە بەهارەکەی ساڵی کۆچەڕەوی
خواوەندی عەرش و ئاسمان و زەوی
خێر و خەڵاتی چاکی پێ داوم
منیش خستۆتمە سەر پێڵوی چاوم
دوو دەست و قاچم لە کار وەستاوە
هێز و جوڵەیان تێدا نەماوە
لە دەست ئەو دەردە خامۆش داماوم
وەک گوڵی تینو بۆ ئاو سوتاوم
بەڵام پڕ بەدڵ سوپاس گوزارم
مەمنونی خودای پەروەردیگارم
چونکە فەرموودەی (رسول الله) یە
خەڵکی بڕوادار سەر بە بەڵایە
ئەم موژدە خۆشە بە خێر و چاکە
بۆ ڕۆژی دوایی خۆری ڕووناکە
چونکە هەرکەسێ خوا ڕێزی لێ نێ
جار جار ناخۆشی بۆ دەسازێنێ
تاکو لە دوا ڕۆژ بژێ بەشادی
دووربێت لە پەستی و لە نامورادی
جاداوا کارم خوایە گیان لەو سەر
تێر ئاومان بکەی لە حەوزی کەوسەر



ڕێگای هۆشمەندی

لەکتێبخانەی گشتی هەولێر
ژمارەی سپاردنی ( ٦٤٤ ) ساڵی ( ٢٠٠٥ )ی دراوە
چاپەمەنی سیما - سلێمانی - شەقامی مەولە